❊ ماچستان ( هۆنراوه).

❊ دارا ئەحمەد.

❊ چاپی یەکەم - ٢٠٠٨ .

❊ بەریتانیا - هودرسفێلد.

❊ چاپ و کاری هونەریی : " ئەمڕۆ " .

❊ تابلۆکان :شەمال عادل سەلیم و بورهان هەژار و ... .

❊ هەردوو تابلۆی بەرگ : شەماڵ عادل سەلیم

❊ بەرهەمهێنانی "ڕۆژنامەی ئەمڕۆ" زنجیرە (٣).

❊ پڕۆژەی" کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردی - کێرکلیس".

❊ لەسەر ئەرکی " کەلچەر ئەند لێژە سێرڤس " چاپکرایە.

لە بارەگای (با)ڕا دێم و
روبباری تۆزم بڕییە..
بەران دیسان
قەوارەکی خامۆش و بێدەنگییەکی ئارام
لەخۆمدەپێچی و
گەردە رۆشنەکانی سەر چرۆی ئەندێشەشم
وازناهینن..
تاوەک دەمفڕێننە
سەر لەشولاری شۆخە سەرمەست و بندەستەکان
تاوەکیدیش
سەر شەرموشووی رەوتە سەرقۆز و بنئارۆزەکان
ئای لە تاوانی ئەو پەنجانەی
نەیانزانی
چێژی هەرکوشینی گورە رەنگاورەنگەکان چییە و
هەروەرین

نهێنیی گەمەکرن بە پەلاپیتکەکانی ئاگر چییە و
هەرتۆقین.
لە بارەگای (با)ڕا دێم و
باوشەک پەیام و پەیمانم بەرێکردییە..
تاقە چارەشم هەر (با)یە،
هاوڕەوتی با
بەسەر تیشە تیژەکانی کات
دەخشێین و
بە ماکیاژی کورە کیژانییەکان..
کیژە ناحەزبەخۆیەکان
سنوور سنوور
نەخشەی ووڕات .. ناوچە .. کیشوەر...
- هەرچی شەرمەزارییە -
دەسترێنەوە.
لە بارەگای (با)ڕا دێین و
چەکی دەستمان
تیشکی سەرنج و نیگایە
پرێسکەی گەشتمان
پڕ پڕ ماچە..

خێرا..خێراش
داکە جەرگ سووتایەکان
لێکرِامانی ئەڤیندااران
پێچاوپێچی ڕێ و ڕێچکۆران
دەمانبڕن،
ئەوشۆ قۆناغمان ئێرەیە..
لەسەر لێواری ئەو ئاوەش؛
جێژووانی(با)و
ئەو لێوانەی لە ماچ پتر هیچ نازانن
ئێشکگرەکانی نەریت و بازاڕی سۆز لەدوومانن
پاسەوانی بزە و جوولەی لێوانمانن..
ئێرە دەریای (مەڕمەڕە)یە
هاوپشتی دەریای (ئێجە)یە
جێژووانی(با)و تیشکۆی نیگا و
مەکۆی موچڕکی سەرگەرمیی و دەستبازییە،
هەر لێرەبوو
لۆ یەکەمجار هاوڕێ(با)م دیت؛
لەبن درەختی جوگرافیای بنار مێژوو
سەرو پێکەک بارانی ماچمان هەرقوڕاند،

هەر شەوێدی
ئێرە جێژووانی هەمووان بوو..
لەبن سێبەری رۆشنایی
(( ئازادیی ماچ لۆ هەموومان ))!
یەکەم کۆنگرەی ئەڤینداران بەڕێکرا؛
حەز و ئۆخەی پڕ تامەزرۆ
بارەفرکەی بزە و نیگا
هەرچی پێیدەرێن راموسان
سەرلەبەری ویست و ئارەزووە کپەکان
سەربەست.. سەروەر.. پایەدار بوون...
هەر لەو کۆنگرەش
هاوڕێمان (با) لۆ یەکەمجار
بە یەکەم و دوا سەرۆکی ئەڤینداران
هەربژێردرا.
ئەوشۆ لە قۆرایی (با) رانامینم
تا وورشەی دری خۆم ببیستم
ئەوشۆ زۆرە سپیە کافوورییەکەم
- درە ناسک و بێگەردەکەی هاوسەرەکەم -
بەجیدێلم و خۆ دەخزێنمە خورجێنەی (با)..

هاوڕەوتی ئەو
تیشە تیژەکانی کات دەبڕین و
بە هاوکاریی
تیپەکانی هوڕە و زریان
گەردەلوول و سروە و شەمار و ڕەشەبا...
هێرش..هێرش ، قۆناغ..قۆناغ؛
لنگی دەریا..مەمکی زەوی
گۆنای عاسمان... ئازاد دەکەین..
سەرلەبەری دەر و دەروونی گەردوونیش
بە (مۆر)ی ماچ سەرمۆر دەکەین.
لەبارەگای (با)ڕا دێین و
هاوڕەوتی ئەو
ئارای ئازادیی و نان و ماچ
لەسەر دری دەسەڕاتی سۆزفرۆشان
دەچەقێنین.
سبەی‌شەویش
بە چاودێریی ئەڤینداران
زەماوەندە؛
زەماوەندی دامەزرانی تەختی ماچان.

له بارەگای (با)ڕا هاتین

رۆژانی دی.. شەوانی دی ، هاوڕەوتی (با)؛

هەر بەربەستان دەڕووخێنین

هەر سنووران تێکدەشکێنین

هەر ماچ

هەر ماچ

هەر ماچ لە رووی یەکتریدا هەردەکۆرین .

له بارەگای (با)ڕا هاتین

ئەوەی بە یاسای بێیاسای ماچوموچیش درگران بی

له بن ماچان رایدەبیێخین..

له بارەگای (با)ڕا هاتین...

تەمووزی ١٩٩٦- کانوونی دووەمی ١٩٩٧

ئیستانبول - تورکیا

لەگەر بارانەک داباریم
بوومە هاوڕەوتی لێژایی و لێژاییتر..
لە بارانەک دەدوێم؛
نهێنییەکانی تەڕایی ئاوی دەزانی و
بەچاوی‌خۆی..کاتە مێخۆشەکانی
ترپەترپی دری شەوانی شەقام و
ژۆرە پڕ سۆزەکانیشی.. دیتبوو.
وەی لەو درۆپە شووشەییە رۆشنانەی
لەبەر پێی ئاگر
دەپرژانە سەرپەڕی گورە لاولاوەک..
سەر پەرچەم و شان و ملی
رێبواری رێی چوونەژووانەک..
سەربارى نەرمونیانی پەپوولەکی،

شەوێدی تۆپترەڤەی ماچەک
بنمیچی سەماگەکی تەقاندەوە
بەتەنێ باران چووە هاواریان،
ئەوشۆ تارماییەک لەجوانیی
رۆشنایی پەنجەرەکانی تەنیەوە و
رێبوارەک لەکۆران داگیرسا
هەر بەتەنێ باران هاتە هاوارمان،
سبەیشەویش
پەیڤەکی ئاگریی.. تیچاوەک.. نیگایەک
هاراوی جەستەکی .. هەرماندەپرووکێنی
هەر بەتەنێ باران دێتە هاوارمان..
لەو باغە نان و ماچەکم خوارد
لەویدی نان و بارانەک..
لەو گەردەنە جامەک مەیم هەردا
لەویدی یەک مژ لێو..
تادێ پەرژینی باغەکان
لە جەستەم رووەدچن
خەناوکان لەملانم..
ختمتر دەبنەوە..

تادێ دوژمنداریی من و چەتریش
فراوان و فراوانتر دەبتەوە،
ئێرانە نیشتمانی منە
لە ناوانی هەر دووەکی گۆڕەکم دەوێ..
ئەمن هەر یەک کات .. ناوانی دوو لێو
یان دوو هەر کەرخەک .. دەمخرۆشێنن؛
کە لە ناوانی دوو درۆپە باران
سەرمەستدەبم،
لەو لێژنەبارانە پڕتاوەش
رایەخی خۆم
لە ناوانی هەردووەک رادێخم و
بەرەو بنیبنەوەی نهێنییەکانی
تەڕایی ئاو و
دیتنی کاتە مێخۆشەکانی
ترپەترپی دری شەوانی شەقام و
ژۆرە پڕ سۆزەکانیش
لێژدەبمەوە.
دوونێ لە باران دابڕام
گورزەک ئاگر گەمارۆیدام..

ئەورۆ لەگەر تەم رێککەوتم
بوومە هاورەوتی بەرزایی و بەرزاییتر..
ئاخ لە بەرزبوونەوە
- چ ئاوارەبوونەکە لە سۆز و تەڕایی - !
لە لەنگەری دوادواییێش
لە دورِ هەورەکی سەرکێش و پڕ باراندا
بە شەیپووری ئاوازی با..
بە چەخماخەی برووسکان و
بە گرموهۆڕی گەواران
سەمای دوا جەنگمان دابەستا،
دەبا هەنکە هەر بزانن
ئەمن ئەندامی بارانم و
دەمەوێ بنمیچی کۆنگرەخانەکان
هەرتەکێنم..
دەمەوێ پڕ بە شەیپووری ئەندێشەخانەکان
بانگرادێرم؛
(( ئەمن ئاوم..
هەر خودی خۆم
هەموو تشتەکی زندیشم ))،

ئەمن هەنکە هەر ئەوهامە..
هەرکێی لەسەر ئاوەکانم شەڕ بەرپاکا
بە لافاوەک دەیخنکێنم،
دەبا هەنکە هەر بزانن
ئەمن گیانی رووبارانم
نێربی مێبی لۆمن یەکە
ئەوەی نەزانی ژووان چییە و
دژی یاسای دانوسانی رامووسان بی..
نیگا و بزە .. ماچ و گەزە ...
هەر پەیڤەکی فەرهەنگی ئەڤین بفرۆشی
بەرەو دەریا و ئۆقیانووسان لوولیدەدەم.
ئیدی ئەمن هەر ئەوهامە..
هەر خۆم خودی بارانم و
دادەبارم،
لە یەکەمین لێژاییشرا تا لێژاییترین کونج
نهێنییەکانی تەڕایی ئاو
ئاشکرادەکەم..
سەرلەبەری کاتە مێخۆشەکانیش
لە شەقام بی یان لە کۆران

لە ژۆران بی یان لە باخچان یان لە سەربان...
- لە هەر کەرخەکی جیژووان بی-
پڕ بە قەوارەی درۆپە تەڕ تەڕەکانم..
پێشاندەدەم.
ئەمن ئیدی هەر ئەوهامە
ئەمن بەخۆم بارانم و
بەرەو لێژایی و لێژاییتر و لێژاییترین
باوەشی سۆز .. دادەبارم.
من
با
را
نم .

ئایار - ئەیلوولی ١٩٩٨
هەولێر

# حەیرانی هەڵەبجە



Helebce - tabloy awiy, 60 x 55,Kurdistan. jpg – Şemal A Selım

دەروون بە بارەک ژەنگەوە
دەنگی گۆرینێی قۆستەوە
گوزارشتەک لەخۆربگرن
بەستەی شەختە
لە دەروازەی بەستەلۆکدا بچرپیتەوە
تەریفەیە
لێوی بە لۆکە تەڕمەکەن.. کەف هەردەچڕی
پەریشانە
سەری لە کانی نوقوم کەن.. گیانیدەردێ
شین شینـنابی
بە خواستن شاییەک دابەستن
سبەی دووزبەی
گیانی پشکۆی
لە هاراوی ئاشتی دەگری.

*           *           *

كاژێرِ كاژێرِ
زۆزانەئەندێشەی دەردەكانی
دایەبەرچاوی بارانەخەو
وێكڕای ژێیە خاوەكانی هەساوی هێڤی
كشت..كشت، بایخوارد
گەردیلەخووی تاوەباران
پەڕوباری زریانەبایان هەرقاچی
بەرەو دەڤەرە دشەكانی زەریا
سواری شەپۆلە ئازادەكانی بركی زەویان كرد،
هەر لە چاوترووكانەك
(چینەكەش)ی ماخولیانی برِ..برِ، برِی...
ما تەوەری كێشەچەپەر لەهەوكێیخا
هێشتا بەژنی
وەبەر شەپۆلەماچانی بەژنی سركی نەتزابۆوە
پەنجەی شەیدای داخزانە كەمەریەوە
كە (هەركەو)یش لە بنار لووتكە
لێوەكانی داوراندنەوە
هەردوو قوتكە

لەبن دەندەی سینگی رووتی تاوانەوە،
بین..بین، چێژی ئاوەباران
تا بەر لێزمەی دژەئازار وەئاگاهات
سەرمەستی کرد
بینەکیدی
مژلدانی لە رۆندکاندا تەژیبوو
لێوی لەسەر کەنار چزا
دەقەر تێکرا ؛ هەرکەو.. قوتە ، کەمەر.. هەساو...
لە دورٍ گڕی بەندوباوی
زۆزانەئەندێشەی دەردەکانی
قرچ..قرچ، سۆژیا.
دەوجا لێلێ .. لێلێ لەتو قەلەندەرێ
دەوجا لۆلۆ .. لۆلۆ لەمن دەربەدەرێ .

*  *  *

شەوگارەک بوو
دەسبێنەکەی سۆرەبەنم
لە گەردەنی نازداریی چیا شەتەکدرابوو
زۆری کۆشا
پێ بە رایەخ کۆشکی سالاراندا نەکەین

- به لاساریی خۆشماندەویست -
شەپیوورەکەی وەبان چاوان
تا بمینێین
لە رۆخ ئاتەشەڕێیاندا
قووچەکەسەهۆر بچینین
بەناو زریانێش دا بڕۆین
قۆناغ..قۆناغ، غەرەپشکۆ بەجێبێلین
بەران بیانگە دادی نادا
باش دەیزانی
لە نیوەشەو رۆژمانهەری
شەوپەرستان لەسەر سنوور دایدەچینن
بێبەریی لە توش
کێ پێیگۆتی
- بابی مردییان لۆی چرپاندی -
بەدوو دەستبێنێ پساتدا
تەکانبدەی
لەبەر دەری کۆشک و تەلاری ئەوانداا
دەرۆزە بکەی !؟

* * *

کۆستەکی دی
بارگەوبارخانەی دابەزاند
ئەرێ مێژوو شەکەت نابی
هەندەیتریش شەتەکدرێین
کزە لەناخمان وەنایێ!
*　　*　　*
دێتەبیرم - بە گچکەیی -
لە هەر دەمەک داکم دەیگۆت:
((ئۆە رۆرە گیان
نە بەردی سارد..نە بەردی گەرمت
بێتە ری.))
دادەخورپام؛ هەستمدەکرد
وا ناسۆریی
بەژنم وەکو بەژنی قەندیل
لە تەمدەگری
بەران هەنکە پێچەوانە
کەنگێ هورە
دەمپرووکێنی..دەمبرژێنی..دەمسوتێنی
کەنگێ زریان

دەمتەزێنی..دەمخووسێنی..دەمڕزێنی
هەنگێ درم دادەخورپێ
چونکی هوڕە و زریانی من
- لەو وەرزەدا -
گازاویین و بێدەموجەم..بێپارێز دێن
تەنانەت شنەیشەمار و
کزەبای مانگی گوران و
نەرمەسرووەش لەو خاکەدا
هەر گازاویین..
بێ بۆنی مەرگ هەرناکەن
بێ بۆنی مەرگ هەرناکەن.



Em wilate serabeki efsunawiye-70x60,finland.jpg-Şemal A Selım

مۆرەتە غەم

برژانگی پیرە دێوەرەی دوارۆژی هەرکرووزاند

زەریا، گەرد..گەرد

خۆرەمێشی بە هەورە ئاوسەکان سپارد

دەوجا لێلێ دەوجا لۆلۆ

لێلێ لەتو قەلەندەرێ.. لۆلۆ لەمن دەربەدەرێ

پشکانیشی چەند ئاودارن

پەردەی ئاسمانی زەردپۆشمان دانەدرین

بە هیچ کلۆج و بابەتەک دانابارن.

*　　*　　*

جلكی سەهۆريان پۆشيبوو
لەسەر رنوو
تابلۆی هەنگاويان دەكێشا
كێ دەيروانی.. كێ دەيزانی
لەپی شەقام پڕ شەقارە - شۆستە نەبی -
خێڵ و وێلان
يەک..يەک، پەراسووی سوتايان
لەسەر بينايیم هەرپەسارد
هوڕ و لاران
نيو..نيو، ترپەی دری گەرميان
لەسەر ژێيانم دەچڕاند
لێلێ لۆلۆ لاوكی ناخيان
بە گێچكەمدا دادەچريكاند..
سووچم چييە
تابلۆی رەوتيان
لە دوڕ بۆتەی پەرپووتييدا شيبكەمەوە
وان بەستانەش لە شاكەزيەک بهۆنمەوە.

*　　*　　*

شۆدانەوە پڕ مادایە
هەوساری توش
شین و واوەیلایە
یان
زەردەخەنەی دزرای منە
لە بەیاری بزربوونیش خۆوەشێری
داپچڕینی شەویلاگم
بۆنسۆی کۆرەمستەکی داغدارە
سەرچیغ مەچوو
حەیرانی مەرگەکاس
لەناو کێرگەی کەللەسەران
یان
هاوکێشەی "هاڕژنی پێکەنینو قاقای گریان ! "
نامخرۆشینن.
کسۆکی بەر دەریی
خانەخوێیە چڕوساوەکان نەما پێمنەوەڕن
کەڕنەڤاڵی
شۆخە تەڕ و شێدارەکان نەما
پێیانڕانەگوزەریبم

نە جارەک مرچەی ماچان بە مێوانی ڕاگرتین
نە حەزی کفت و تەریفەشمان
- لە بای تەکانە ڕەوتەکدا-
لە کارێزەک نوقمیکردین.
دەوجا لێلێ .. لێلێ لەتو قەلەندەرێ
دەوجا لۆلۆ .. لۆلۆ لەمن دەربەدەرێ.
چڕنووک لە تیتکی ڕۆژ نەنێین
ڕنینەوە ئەندێشەیە و
ڕامووسانیش هەر لێگەڕێ.

* * *

کاتەک ویستمان
تاوەک لەسەر قاقۆلی کێو جۆلانێکەین
ئەگەر هەر نا وەکی سۆفە
لەبن نساری لووتکەکان لانە چێکەین
تووتی درمانیان سەربڕی،
کاتەکیش زۆر ساویلکانە
بە بەزمورەزم و ئاوازی مفتەخۆران هارمۆنماندا و
بووینە فۆڕمی دووەم سیمفۆنیای هەڕوگێف
گۆتیان هەیرۆ

کێوەکانمان دوژن بووینە !
بە تۆن تۆزی زندوزاریان
بەسەر قاقۆڵیان پرژاندن!!!

*　　　*　　　*

بە قەد شەپۆلی هێوارەی
ڕەوەزەبەردەک هەرزەناین
تێر..تێر،ستریک گیانی شێلاین..
هەندەی نەما
قۆپکە و بنار لێکگرێدەین
بە ئەستوونیی و بە ئاسۆیی
لەت..لەت، کراین..
ئەو دەمانەی
بە ناچارییش کەوتینەبەر تیکودورمان
هوڕەبای زەرد
هوڕەبای رەش.. ئی سپی.. ئی سۆر...
بست بە بستی کێرگەی حەز و ئۆخەی کێراین،
ئەوە چییە
دەنگدانەوەی شاخە
یان زرینگانەوەی ئاشکراییە:

هۆۆۆۆۆو
هۆۆۆو براله
هۆۆۆو خوشکۆره
لەناخەوە گاستان دەکەم
شوونهەرگریش برابەشە
تیروپشکەکی دەکەوی
کێبوو لە بزنەڕێیاندا
راستەشەقامی داتاشی
کێبوو بە تەرمی پەپوولان
کەفوکوری دادەمرکاند
کێبووووو...!؟ کێبووووو...!؟
چیلکە لە زەوی وەرمەدەن
هەتا زووە
با لە داروپەردوویاندا
کەژاوەکیان لێچێبکەین.



40x30,Hewler.jpg – Şemal Adıl Selım -

پەپوولە سپیەکان

لە سپیتییان چوونەوە

چاویان لە ئاست بەژنی گرکۆمان هەرنایێ..

کەپرۆکەی کان

هیزەی رەنجیشمان لێچککا

ژەنگ و خۆرک نایبوێرن

ئەگەر نەشێین مۆرەی لە گور لۆ هەرچنین

ئی زەرد ئی سۆر .. نەوەک ئی رەش

- بۆنی تەکنیکی لیۆەبێ -

بلا هەردوو چاوانی من .. چاوانی تو

دابرژێن .. بێنەدەرێ.

*     *     *

- ٣ -

جەستەی دەروون
بە یەک پارچە قەتماغەی تەڕ داپۆشرایە
دێ سارێژ بێ
ڕێچکەی هاوار لە لافاوی داڕسانی
دەنگ هەردەبڕێ
میکرۆب سواری شەپۆلانی سستی دەبن..
داوەڕستی پەریشانیی چرکە ڕەتێندرایەکان
لەبن تێنی بزربووندا
قەف..قەف، سەرگەرمی پسان بوو
تاوێرەکان
بەرەو کەنارە کەلاکەتیەکان
غرەی غلۆربوونەوەیان دەهات...
نە کێوەک دەنگیدەداوە
نە سنوورەکی سۆزدار هەبوو
لەسەر ئاوازەک بیژەنی
ئەوەی ماوە
تەنێ پەڕی تۆزلێنیشتیی ئەرشیفەک بوو
کە ئەویشمان هەردەداوە بە پەنهانیی

گەرووی رامارین پێخەنی
تێقوچانیش
تک..تک، فرمێسکی داباراند.
دەوجا لێلێ.. لێلێ لەتو قەلەندەرێ
دەوجا لۆلۆ.. لۆلۆ لەمن دەربەدەرێ.

* * *

لە نۆژەنرا
هەر زنارەک پەیژە دەدرا
بە کەللەسەر تانۆک دەکرا
هەر رێبوارەک.. بە خەناوکەی ئەڤینی خۆی
دەست و پێیانی دەبەسترا..سەرچیغ دەخزا...
گور و شالوور لێکدووشک بوون
ماسی و زەریا لێکمڕومۆچ ...
هەر بابابوو
زەرەدەخەنە و ماچ و ژووان و رامووسان و...
هەرچی پەیوەست بە ئەڤین بوو..
بارپاندەکرد!
یاران
توگیانی یاوەران.. مەیهەژێنن

به هیچ ڕەوتەکی مەچووێنن
رووبارەکی سەرەڕۆ بوو
روو لە زەریای مەرگ نەبی.. چیدی نەبوو
* * *
دیسان پەنگر
لەناو گڕی ئەو لافاوە
کراسەکی ئاودامەنی
ڕەنگخۆرەمێش - گورگور خین - ی بەڕاداندا
شاشە پۆلی گرمخاوی
لە هاراوی تەرمە بێنازکەتیەکاندا خڕکردەوە
بە ئاودڕگەی پاشەوپاشی
روخسار زندییە مردییەکانی شۆڕکردەوە..
دەستم دامەنتان لێیمەگرن
ئاکامەکی زۆر لاسارە
بە تیغەکی ژەنگاویی و کول لە پزدانێ بڕایەتەوە
برینانی سەخت و قۆرن
لەبن باری سایەقەدا سارێژیانکەن
با ئاو نەدزن
لێوی بە خوسار تەڕبکەن.. با نەخنکێ

سەری بەسەر گەلاوێژکەن.. با راکشێ
بە تریفەی مانگ داییپۆشن.. با بخەوی..
بە تریفەی مانگ داییپۆشن.. با بخەوی.

* * *

ئەو دەمانەی لەبەر تیشکی هەیوەشەوان
سەرم بەسەر قۆروباسکی نەرمی دەکرد
دەمگوت ( دایە .. لۆ ئەو مانگە لۆ خۆ نەگرین )
دەیگوت ( ووسبە.. رۆرە ووسبە.. با کۆر نەبی )..
لەو رۆژە دووروودرێژانەش
بەدیار بۆردی کۆنترۆلی کار
خەو لە چاوی ماندیم دەزا؛
رۆبۆتەکان بە تەقەتەق
تێزی دانا و زانایانیان بە گێچکەمدا رادەدێرا:
(ماکی رووی مانگ
خڕێ و دۆر و نسارانن..رەش دەنوینن)..
نوکەش لێرە کە بەرد بوویتە بالیفکم و
زنارەکانی سەر سنوور زاری دڕی دێوەکانن
بن پێیانم دەلێسنەوە؛
هەموو شەوێ - هەیوەشەوان -

ناخی ئاخم لەبن سەرم دەنارێنی
پێژی رابە.. ئەوە ئەمنم
سێبەر لەرووی مانگدا دەکەم .. قورٍ دەپیوم
رابە گیانە
جۆخینەی مانگ چەندی گەشبێ
ئەمن هەندە رەش دەنوێنم.
دەوجا لێلێ .. دەوجا لۆلۆ
لێلێ لەتو قەلەندەرێ .. لۆلۆ لەمن دەربەدەرێ
تا بەربەستی چەک و چەمکی چلوورەیی دانەڕووخێ
چجار شەپۆلی پەنگخواردییم
لە لافاوی زەریای ژیار ناکاتەوە.

*　　　　*　　　　*

دەروون بە بارەک ژەنگەوە
دەنگی گۆرینێی قۆستەوە
گوزارشتتەک لەخۆربگرن
بەستەی شەختە
لە دەروازەی بەستەلۆکدا بچرپتەوە.

تشرینی دووەمی١٩٨٩ - تەمووزی١٩٩٠
ناوزەنگ ، بناری قەندیل

باخچەک.. تەڕتر
له پەلکە کەسکەکانی باران
بەناوقەدی دەروونمدا هەرواسرایە؛
کەوشەنەکەی
بە برندایی گشت پەرتووکە چۆپانییەکان
بە خشتی ئاو هەرچندرایە
پانایییەکەی
بە ئەندازەی گشت زیندانە زەوینیەکان
سەکۆی(ئەوپەڕی ئازادیی)..
جێژووانی ئارام ئارامو
پڕ لەترووسکەو چەپکەتیشکی لێچێکرایە.
هەر لەو باخچە بوخچەیییەدا
- کە ڕۆژ لەوێ ئاوا نابێ -
بێ لە قۆپچە ڕەنگقورمزییە سامناکەکان
هەرچی چشت هەیە کەسک دەنوێنێ؛
ئاوهەوای، داروبەردی، باوبۆرانی...

تەنانەت .. گوروگورزارە ڕەنگاوڕەنگەکانیشی
هەر کەسک دەچنەوە.
لەوێ.. چجار شەو دانایێ
تا دربەستەیی چرا بی
یا تا بتەوێ
راز و بوون و گوزارشتی
پەنجەرەکان، دەریچەکان، کراوڕۆژنەکان.. بزانی
هێزەک، ڕەوتەک، دەنگەک نییە
بەدوو پلەوپایەکانی کۆشککەوێ.. سەرگەردان بی
ڕەنگەک نییە بە خین بچی
تا نیگاری مێردەزمە و دێوودرنجی ناو ئەندێشان
فەرمەسۆنە کارخانچییەکان
سەرۆک و شا و گرگنەکانی پێبکێشی،
خواردنی ئەوێ؛ هەر تەڕەیە یان مێوەیە
خواردنەوەیان ؛ رۆژێ یەک شووشە ئارامیی و
دوو سێ دنکە ئەندێشەیە،
کەس چەمکی خێزان ناناسی
تا لەرزوتای بەیەکچەسپان
یا لەرزوتای دەستلێکبەردان.. گرووی بکا،

خاوەنداریی هەر لەبنەوە بوونی نییە
تا گیرۆدەی پارەوپوول بی
یا دەربەستی شەڕوشۆڕ بی،
لەویَ.. نە بێکاریی هەیە، نە کار و بێگاریی
نە یاسا و ڕێسا هەیە، نە یاسای بیَیاسایی
ئەوەی هەیە.. تەنیَ گەشەی چێژەکانە
یان چێژەکانیی گەشەیە.
ئەو باخچە ناوی (چشاوە)یە
چشاوە: جیهانەکە لۆخۆی
جیهانەکی پڕ نان و ماچ
کەموکوڕیی لەچاوانی مندا هەبی.. لەودا نییە..
هەر خۆشم لۆخۆم
سەرۆک و بنۆکی ئەو دەڤەرە یەکسانستانەم..
لە سەرپەڕەکی ئەو باخچە بیَهاوتایەش
گۆمەکی قۆقزیی
بە ئەندازەی دەریاچەکی
لەسەر لقە ترووسکەکی دەلەرتەوە؛
ئاوەکەی نە لە ئاستی دەریایە
نە برندتر و نەویتر..

رووی‌بنه‌وه‌ی؛ په‌لکه‌چناره‌کی‌گه‌ش‌ئاسا خۆده‌نوێنی..
دیواره‌که‌ی؛ ته‌یمانه‌کی تێکئارایه
هه‌ر ده‌رێی گۆڤه‌ندی دارگه‌ز و تووله‌مێوه،
ئا ئه‌و گۆمه له‌هیچنه‌چووه
که لێواولێوی رۆشنایی‌و سه‌گه‌ماسی‌و ئاوی که‌سکه
تاقه پێته‌ختی بێته‌ختی کیشوه‌ری چشاوه‌یه.
شه‌ڕی من و گه‌لی چشاوه‌ش
هه‌ر له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه؛
کاته‌ک ئه‌وان - لۆ دیده‌نیی و به‌زموره‌زم -
له‌سه‌ر دیواری پێته‌خت خڕده‌بنه‌وه
ده‌می وه‌ڕسیی و بێزارییان - به خه‌نده‌کی گه‌مه‌ئامێز -
ئه‌و سرووده‌ی
زه‌وینشینان ده‌چڕنه‌وه :
(( لیێره.. له‌وێ..له هه‌ر زیندانه‌کدا که هه‌ین
هه‌رڕۆژ بێگاریی بانگئاسا...
خه‌و له‌چاومان ده‌تۆرێنی و فه‌رمانده‌دا؛
خه‌ونه‌کانمان، رازه‌کانمان، هه‌ستونه‌ستمان.. دابکه‌نین
به کونجه‌کی زیندانه‌کانیان بسپێرین..
جلکی کاری کرێگرته‌یی له‌به‌رکه‌ین..

هێزی بیر و هێزی بازوومان بفرۆشین..
تا ئێواران.. یەکنانی هیشک لۆ خۆمان
سەتان نانی گەرمونەرم لۆ خاوەنکاران پەیداکەین!))
چشستانییەکان
نە دۆستداریی کەس دەکەن .. نە دوژمنداریی..
بێجگە لە سنووردادخستنیان
لە رووی خەرکی دەردەداری زەوی
مەرگەمووشی (دووکەرتبوونی کەسیی)
هرِی لە برِی ناکەنەوە و
چش دەربارەی زەوی نازانن :
دەربارەی دەنگی هەرووەرینی گورە جستانییەکان
سپیبوونەوەی رەوتەکانی تەمەشا
دارِوخانی کۆشک و تەلارە مێخۆشەکان
بۆگەنیبوونی ئەستێرەکانی سەرشەقام
خۆلەیەکدانیجەمسەرەکانی مەرگو زیندەیی
دەربارەی خودی خۆشیان ؛ هەر هیچ.. هەرهیچ...
ئەمنیش لێرە
لەناو گەردوونی دەروونم
پرِ تەریفە و پرِ تامەزرۆ .. پف هەرمایمە،



327x 480 .jpg– Şemal Adıl Selım

ئا هەر لەپشت
ئەو حەسارە ئاوییەشەوە
دایۆم لە دورٍ دایسانی زەویەوەرِا
- بە هانکەهانک -
چەپکەک گوری سۆر و گەشی لۆ هینایمە...
دانیشتیانی ئەو دەڤەرەش
کە لە جوانیی و دەنگورەنگ و
بۆنوبەرامە و چێژەکان.. سەرریژبووینە

کەنگێ حەوجە بە گوری سۆرن..
هەر نازانن تەریفەیی و تامەزرۆییم..
گەشتی داکم و پەیامە پڕ نهێنییەکەی
چ دەگەینن.
بەران ئەخەر ئەمن چ بکەم !؟
بە رەچەرەک، بە بیری چەک.. زادەی زەویم
وەدەزانم
ئەگەر دیوار و سنووران تێکنەشکێنم..
یان گوری سۆرم خۆشنەوێ و
داکم نەیێخمە سەر تەختم
لە گور و گۆیندانم بگری؛
چجار تێنیتییم ناشکێ و
سەرلەبەری چشاوەشم لەدەستەچی،
بەران ئەخەر ئەمن چ بکەم !؟
نە دەمەوێ زەوی لە غەم نوقوم ببی
نە تەختەکەی چشاوەشم لەدەست بچی.
بەران ئەخەر ئەمن چ بکەم چ !؟

کانوونی یەکەمی١٩٩٥ – شوباتی١٩٩٦
تاران – ئێران

له دورِ جەرگەی تاریکستان نیشتەجێمە و
چەپکەک رۆشنایی گەشگەشم دایساندیە..
لەبن شەپقەسۆرەکەشم جیهانەک هورتکە ئەستێرە.
پێرێ پەیکەکی رازپەنهان
پەنجەرەکی پڕ ئەفسوونی لەتاقی ئاسمان داتاشی..
کاتەک جارِی مەرگی شەو و
مژدەی هاتنی هەتاوی دا..
ئەمەی بەتراویلکە سپارد..خۆی بەخەونو ئەندێشە.
دوونێ دورِناسەک - گەڕیدە -
رازی نامۆیی و ناگزووریی پەیدۆزکرد و
لەسەر پەڕی گورەکی سۆر
هەتاوەکی کەسکی نەخشاند..
تا هەنووکەش چاوەڕێیە
خڕایی زەوی تەختکا و رۆژ لە چەقی دابچینی
چێژی نانوماچەک بکا.. بە نانوماچان بچیت و
سەرخەوەکی شیرین شیرینیش بشکێنی.

پێشی مێژوو گڕکانەکبووم:سۆرسۆر وەکی گۆنایداکم..
ڕەشڕەش وەکی پرچیبابم،
پێشی مێژوو.. ترێی چاوە ڕەشەکانو..
خورمای لێوە شیرینەکانو
بە هاراوی تینوتاوی من پێگەیین ..
بەران ئەورۆ.. چەرخ چەرخی شەوبارانە؛
دیدەکانم، لێوەکانم، تێکڕایجەستەم.. زندانیینو
ڕەنگی مەرگیان لێنیشتییە،
پێشی مێژوو.. دەنگی ووشە مەرجانییەکان
ڕەزمی هۆنراوە ئاوییەکان
لە سیمفۆنیای هەرپژانم دادەبارین ..
بەران ئەورۆ.. چەرخ چەرخی شەوبارانە؛
ووشەکانم، ڕستەکانم، تێکڕای ئەندێشەوئاوەزم
تشتگەلەکی سۆزاویین و
تک..تک،گوراوی ڤیانەکی پڕئازاریان لێدەچۆڕێ.
ئەورۆ چەرخی شەوبارانە..
زۆر لەمێژە چاوەڕوانم.. زۆر لەسەرخۆ گەورەدەبم؛
چاوەڕوانییم : ئاوازی بەردەکی ڕەقرەقە لە گورستان
گەورەبییشم : ئاوازی گورەکی تەڕ تەڕە لە بەردستان.

پێشی مێژوو گڕکانەک بووم؛
گور لە پرژی ئاورینگم و
بەرد لە غەرە پەنگرەکانم بە پاشکەتن..
بەران دوونێ.. چەرخی شەوباران دایکردێ؛
پەلکوگورم، خۆروبەردم، سەرلەبەری داروپەردووم
لەبن چرایی تارماییە رەشرەشەکان
کوژانەوە.. تاوانەوە.

*     *     *

لە دوڕ جەرگەی تاریکستان نیشتەجێمە و
چەپکەک رۆشنایی گەشگەشم دایساندیە..
لەبن شەپقەسۆرەکەشم جیهانەک هورتکە ئەستێرە.
کاتەک پێرێ.. لەسەر لمی لێوی دەریای خەونەکانم
دەمرۆنیە بەژنی نەمامەک..
تازەیی گورەک لەلێوم تریوەیدا و
کەسکایی باغەک لە دەروون؛
وەرزی خەزان دایوەراندم،
تادێ.. رووبەری باغەکان تەسکتر دەبنەوە..
تێلدریان لە جەستەم دەچەقن و
پەرژینیان بە خێنم ئەستوورتر دەبنەوە.

کاتەک دوونێ.. لەبن باری شەووەزەنگی خەمەکانم
دەمرۆنیە گۆڕی هەتاوەک..
ترووووسکەتیشکەک لەدیدەم براچەیدا و
گورزەک رۆشنایی لە دەروون؛
ئاسمانەکی رەش داپپۆشیم،
تادێ.. پڕشنگی چرایەکان خامۆشتر دەبنەوە..
تارماییان لەچاوم دەچەقن و
بلەوریان بە ئاهم تەنیتر دەبنەوە.
کاتەک ئەورِۆ.. لەناو چڕیی‌و رەنگاوڕەنگیی‌حەزەکانم
دەمرۆنیە رازی ژووانەک..
ئاوی ئارەزووەک لە جەستەم گێژەنیدا و
رووباری سۆزەک لەدەروون؛
ئەفسوونی ئەڤین دایدۆشیم،
تادێ.. رووی یاران کورژتر دەبنەوە..
بێزارییان لەناخم دەچەقن و
بێکەسییان لەڕوومدا کوژەرتر دەبنەوە.
ئیدی وەکی جاران نەما؛
ئێستا ئەمن.. لەدوڕ جەرگەی تاریکستان نیشتەجێمەو
بەرەو رووی هەتاو رێدەگرم..

ئیدی چیدی
لەسەر لمی لێوی دەریای خەونەکانم و
لەبن باری شەوەزەنگی خەمەکانم و
لەناو چڕیی‌و ڕەنگاوڕەنگیی‌حەزەکانم
ناڕۆنم و ئۆقرەناگرم،
هەر یارەکیش
بەخونچەکی.. بەترووسکەکی
دری بەترپە بکەوێ؛
چرایەکی گەش هەردەکا و
بەرەو رووی هەتاو ملدەنێ.
ئیدی نەما..
ئەورۆ هەرهەنکە ڕێدەگرین؛
دیدەکانمان.. لێوەکانمان..
تێکڕای لەشمان
دەکەینە پرد و پیبەپێ شەقاو داوێین
ووشەکانمان.. رستەکانمان..
تێکڕای ئەندێشەوئاوەزمان
دەکەینە ئالا و جێبەجێ ڕەهایدەکەین.
ئیدی نەما

ئەورۆ سبەی؛
بەناو لەشکری تاریکیی وەردەبین و
لەبەر دەری هەر خانیەکی
لەسەرچەقی هەر رێیەکی..
لە رووبەری هەر جێیەکی...
سەنگەرەکی پڕ برووسکە هەردەکەنین..
شەقاو داوێین،
سبەی دووزبەی؛
بەسەر پشتی دیواری شەو دادەڕۆین و
لە پێش چاوی هەر هۆنەرەکی ئەڤیندار
هەر ئەڤیندارەکی گەردەنکەش؛
گورپەرستان.. رۆشندۆستان..
تێکڕای هەتاوپەرستەکان
ڤیچەک شەپقەسۆرەکەمان لاردەکەین و
چەنگەک هورتکە ئەستێرەی گەش روودەکەین و
شەقاو داوێین.

*　　*　　*

لەدوڕ جەرگەی تاریکستان نیشتەجێینە و
چەپکەک رۆشنایی گەشگەشمان دایساندیە..

لەبن شەپقەسۆرەکەشمان جیهانەک هورتکەئەستێرە.
لەدوڕ جەرگەی تاریکستان نیشتەجێینە و
بەرەو رووی هەتاو ملدەنێین..
دوا چارەشمان هەرئەوویە؛
ئەورۆ هەرهەنکە راپەڕین..
چەرخی شەوباران راگرین..
تێکڕای تاریکیی سەربڕین،
ئیدی ئەوجا
لەبن رۆشنایی و دیمەنی پڕ پڕ قەشەنگی هەتاودا
لە ئاقاری هەر درەختەک
جێژووانەکی قشت چێدەکەین
جێژوانەکی پڕ نان و ماچ، ئازاد..ئازاد
جێژوانەک بی ؛ پڕ هۆنراوە و گور و ئەڤین
ئەوەی بەوەش نیگەران و درگران بی
بە یەک چرا، بە یەک چەپکە گوری بۆنخۆش
دری نەرمدەکەینەوە و سازش دەکەین..
بە چەند دێرە هۆنراوەی تەڕ، بە دوو سێ ماچ
بەرێیدەکەین.
ئەگەر هەر نا؛

به لقه‌ک ترووسکه‌ی ئاگریی ڕێی‌لێده‌گرین..
تا به‌رگی شه‌و فرێنه‌دا و
تێر..تێر، ڕۆشنایی ماچ نه‌کا
هه‌ر دایده‌بڕین.
له‌دوڕ جه‌رگه‌ی تاریکستان نیشته‌جێمه و
به‌ره‌و ڕووی هه‌تاو ڕێده‌گرم
له‌دوڕ جه‌رگه‌ی تاریکستان نیشته‌جێمه و
چه‌پکه‌ک ڕۆشنایی گه‌شگه‌شم دایساندیه..
له‌بن شه‌پقه سۆره‌که‌شم جیهانه‌ک هورتکه ئه‌ستێره.

ته‌مووزی ۱۹۹۹
هه‌ولێر

# له ناوانی
# نەبارینی تو
# و
# بەهەرمبوونی من



لەبن سێبەری خودی ڕۆژ
هەمێزت لە کێندەری جەستەتە..
سێ نیگا دوورتر لە خوازیار نێزیکترم؛
- لە ئاوەک دەدوێم.. دری ئاگری جۆشدایە
- لە باغەک دادەبڕێم.. ڕێیانی لەخینم داکوتایە
- بەدیار برێسەی سوتانم
دابەستە گەرمترین هەرپەڕکێ،
شەقاوەک لە تەمەن
بە ترس و پرس تێپەڕی
تەمەنەک لە ئاوەدانیی
بە یاسای تراویلکە و چۆلەوانیی..
هێشتا لە کێندەری لێوارە پڕ ئەستەمەکانی
دوورگەی ماچانین

تازەبەتازە
دەگەینە دووڕیانی بێچاوەڕوویی و بەسەرخۆداشکانەوە..
کەنگێ بەبەر شەپۆلە لاسارەکانی
سینگومەمکە بەخورشتهاتییەکان دەکەوین!
دەی دەبا لە حەژمەتی حەزە سوورتکەکانمان
خۆ فجورێ
سرووتی سوتان لە سەرمان و
ئەفسوونی گەشتە مێخۆشەکان بکەین..
دەی دەبا بە حەسرەتی بۆنی گورکردنی رامووسانەک
ئاوەکی تیرتر
بەبن تەشکودامەنی کورە سۆزفرۆشەکان و
کیژە خڕ داێخرایەکان وەرکەین..
دەی دەبا لە پیاسەی نیوەشەوە سپیواژەکان
سەرمەستانەتر
هەمێزەکان لە دوڕ جەستەکان پەیدابکەین...
هەرهیچنەبێ
پەنجەرەک لە دەروازە داێخرایەکان
دەبێخینە سەر گازەرەی پشت و
دەروونە تاریکرێژەکان دادەگیرسێنین.

لە ناوانی دەنگی داباریـنی بەفر و
یادەکانی گەرمبوونەوەی شاخ
هەمێزت لە کێندەری جەستەتە..
خەریکە بە بیلبیلەی ئەختەبووتە سێکسبازەکانت
بچووێنم..
چێترە
رەهێرە تۆزەکی سپی وەکی تەم ، شەرمن..شەرمن
یان بەرگی نیوەشەوەکی سپیپات و
تارایەکی قورمزیی رەنگ
کێهان دەخوازی .. بپۆشی..
ئەها ئەوەتە .. ئەمن لەناوانی
دەنگی کرانەوەی گورە نیلۆفەرەکان و
رووتبوونەوەی سینگوبەرۆکی تو
بەخۆم سەرپشکم،
بە رووخۆشیی و تەڕییری خۆت مەنازە
ئەمن لەودیوی ئاهەنگە پڕ داوڕێنەرەکانی قەدەغەڕا
لۆ ئێروکانەی پڕ حەسرەت هاتیمە..
چما هێشتا ئەتو پەیوەستی
تیاترۆخانە هورژایەکانی دەروونتی!؟

دەنە ئەمن
بە تەنێ لەدوو یەک جوایێزییم
لە ناوانی دەنگی داباری‌نی بەفر و
دەنگی پێی هاتنت لۆ ژووان،
بەرکە هەمێزت لە جەستەت جوایزکەمەوە
هەرهیچنەبی
پێکە مەیەک لە قورگی بلووریێت ببینم..
لە باتی دوو کووزە لیمۆش
چەند چرکەکی بەدیار لیێوە مزرەکانت
سرووتی مەرگ دابەستم..
دەپێمبرێ
لەبن سێبەری خودی رۆژ
یان لە ناوانی دەنگی داباری‌نی بەفر و
یادەکانی گەرمبوونەوەی شاخ
هەمێزت لە کێندەرێی جەستەتە...

کانوونی دووەمی ١٩٩٨
هەولێر

تنۆکە کیژەک لە چاوی کوڕێنیی بەدوور
شەقاوی براچەدار لە چاوی شەقام
نەمامی جەستە.. لەسەر دیدەی چاو..
کیژانە رادەبم؛
سەرمەستانە سەرگۆی مەمکانم
لە هەوران دەخشێن،
ئەوڕۆش هەر بارانە و
هەر بێچەتریشین..
وەیش لە شەونمی شەوەکی پڕ خامۆشتر و
بارانی شەوەکی پڕ بارانتر،
لەپشت پەردەی پرچ و برۆت
بە رووتوقووتیی و پێپەتیی
لەسەر قەفی سمێرەکی چڕ و درێژ
سەمای دوا کۆچت دابەستا..

کوڕانە ڕاوی پەپوولان دەنێم
مێبازانە
به بۆنی جێپەنجەی نازدارحەیرانێ سەرمەستەبم..
ئەورۆش هەر بارانە و
هەر بێبەرگیشین..
وەیش لە شەونمی شەوەکی پڕ خامۆشتر و
ئەو کیژ دابارین و ئەو کوڕ دارژانە
لە پەنجەرەڕا لە باران رادەمینی
یان لە قولینچکە گوشادەکانی چاوترا
دەمیێخیە دوڕ بازنەی بەژنت
لۆ منی دوور لە درەوشانەوەی دەستەکانم
هەر یەک تشتە،
چما هێشتا ئەتو
لە دەنگی سرووتی سەرگەرمییم و
هەستانەسەرپەنجەی گیانم ناگەی!؟
دەنە ئەمن
هەر بەو ئاگربارانە پڕ تاوە
بە رووتوقووتیی و پێپەتیی
عاسمان دەینم و لەبەرپێی زەوی سەریدەبرم..

وەیش لە شەونمی شەوەکی پڕ خامۆشتر و
رۆشنایی شەوەکی پڕ رامووسانتر..
دیسان ئەورۆش هەر بارانە و
تنۆکە کیژەکیش پڕژایتە ناو چاوی کوڕێنییم.
وەیش لە بێ شەونمترین و
بێ رۆشناییترین و
بێ بارانترینی
دوا دەستبازییمان.

شوباتی ١٩٩٨
هەولێر

پڕاوپڕی دەریایەک چاوەڕوانیی
سەرگەردانیی بیابان بەملدابڕا؛
ئەوە
هێوارەترین چرکەکانی سەردەم
بەری کراورۆژنە سەرچلەکانی داگرتییە..
دەرفەتی داگیرسانی چرایەکانی بنزەویش نادا،
وای کە چ دەستەکی نەرمونیان و
چ سەرەکی میهرەبانم
لێبەجیما!
رۆژەکی رەش
رۆناکیی لەبن بارەکانی رەشداگەڕایە
چرا لە چرایی کەتیە..
ئارەزووەکان
لەبن چڕنووکی وێردەکان کپکەتینە

سەنگەر سەنگەر بەسەرمکردنەوە
نهێنییەکیان بە جوانیی نەبەخشی،
وای کە چ دەستەکی نەرمونیان و
چ سەرەکی میهرەبانم
لێبەجیما!
لێرانە
لە ناوانی هەر دوو شەقامەک
رارەوەک لە غەم قۆشمە دەکا
لە ناوانی هەر دوو پەنجەک
تاوەرەک لە تەم بەژن دەکا..
ئێرانە
مەکۆی چاوەڕوانیی و
دەربەندی قوتاربوونە..
لێرانە - لە دەڤەری چەرچی و چوختیان -
مەرگ هەر مەرگە و
زیندەگییش مەرگەکی لەسەرخۆ،
ئەوە
هێوارەترین چرکەکانی سەردەم
بەری کراورۆژنە سەرچلەکانی داگرتییە..

دەرفەتی داگیرسانی چرایەکانی بنزەویش نادا،
وای کە چ دەستەکی نەرمونیان و
چ سەرەکی میهرەبانم
لێبەجیما!

کانوونی دووەمی ١٩٩٩
هەولێر

ئاستەکی پڕ ئەستەم
- سنووری سەرانگرێبوون -
شەقاوی نیگاکان .. لەو ئاسۆ
ئاسۆیی دەبیەستی،
رووتایی؛ تەنکە تەمی بەتەنێیی تەنی
پۆشتەیی؛ هوردە ماچە دووراودوورەکانی
لەخۆیهەرگرت.
جێپەنجەی چاوان گرانتر سەرگەرمی کوشینن..
پەیوەستبوونی لاپەڕە سەرمەستەکانی جوانسالاریی
پێشی (دارا دوو داری دی)ی نێرەوزان
ئەفسوونی بنِدیوارەکانی جەستەی خیندەوە..
هاوکاتی تیتلەوبیلبیلە خۆشویستنی مێینان
ئاکاری تیاترۆ برنجییەکانی لەبەرکرد.
سەوجەوسەری لێوەکان
چیدی وێڕاناگەن بارگەی ماچ بگرن..

چیدی ماسولکە گرژەکان
جیهانەک لە ئاوەدانیی
بە تنۆکە بەستەسزمانەکان ناچووێنن.
وا سینگ و دۆند
هێور.. هێور، شەپۆلان لێکدیدەخشێنن
دەمە سپیپاتەکان
بەسەر پشتی خزی ئاوێڕا تێپەڕین..
چەند پڕ شەرمە؛
مێینە زێڕکی لە شیرازەی جلکان بڕژێ و
لێواری ڕۆژنامانی خۆشبووی
نێرینە نەخشەی یەکەم لەسەر دووەم بنەخشێنی..
تەمومژ داکشێتە هەر ئاستەک
- ناوانی ڕووتایی و پۆشتەیی -
شەقاوی نیگایان.. لەو ئاسۆ
ئاسۆیی دەبەستی.
ڕەنگە دەنگوڕەنگی ئەڤینداران
ڕەنگی جێپەنجەی نیگا و سەرنج
خەندە و بزە
ماچ و گەزە...

لەسەر خشتەی بچمی جەستەبازیی بچووێنتەوە
بەران هەردەم ماکەکن هەستورژێن
سۆزبزوێن
ناخبرژێن
لەبەر دیدان ڕەشنابنەوە،
ئاستەکی پڕ پڕ ئەستەمە
هەردەبی
شەقاوی نیگایان.. لەو ئاسۆ
ئاسۆیی بیبەستی.

ئایاری ١٩٩٧
هەولێر

نیوەشەوەکی سپیواژ
لە پەنا دەستە نەرمەکانی ئەندێشە
پەڕپەڕی ئەرشیفەکی ئاوریشمپۆش
رووەتە کونجرکونجرەکان
لێوەک کە تفر هەردەدا
ماچپرژێنکە.
سەرما دەمانسمی
رۆژ دەمانبا
خەو دەمانباتەوە...،
سەرلەسپێدە بە مردیی واگاهاتین؛
شەڕ هەر شەڕ بوو:
لە خەونەوە لۆ جەنگ
لە شەڕەماچەوە لۆ شەڕە گوللە..
لە هەنگێوە
رووەتمان تابلۆی ماکە خوێنتێزایەکانە،

لە هەر جێکاتەک لۆ چرکەک شیندەبمەوە
سەردوولکەی ( شەڕ و شەڕ )
لۆ مندارە هێشتا نەبووەکان
سەربردەی ( خۆم و خۆم )
لۆ ئەڤیندارە بەسارادچووەکان
دەگێڕمەوە.
شەڕ هەر شەڕە و ئاشتییش هەر شەڕ
نیوەشەوەکی سپیواژ و سپیواژتر و سپیواژترینیش
هەر شەڕ..
شەڕ و شەو و من و ماچ و سپێدە و هەرهەمووی
هەر شەڕن..
کە هەر شەڕ بێ؛
پەڕپەڕی ئەرشیفەکی ئاوریشمپۆش
روومەتە کونجرکونجرەکان
لێوەک کە تفر هەردەدا
تامەزرۆتر بەبەر ماچاندە.

ئەیلوولی١٩٩٧
هەولێر

## متوو



Çawerwantim -50x50,Taran.Jpg-Şemal A Selım

پەنایەک.. لە ناوانی
ئەشکەفتە نیوە نەدیتراوەکانی گیان و
رووبەری هوردە رۆشناییەکانی ماچ جێدەکەمەوە،
دوونێ بەژن شەکرستانییەکان بەرەو دەریا
(بارانپەر)ی ئایندەش ناگەڕێنەوە..
ئەوشۆ لە کەنارەکی دی ..
گۆشاوگۆش سەربڕینی خەون، قرتاندنی زریزەی راز
هەرمەکی بنەوشەیی، لەسەرشانی سنوورە
قەدەغەکان
کەنار.. پڕاوپڕی گوردان
گوردان .. لێواولێو لە تەڕەبرین.

پەنایەک لەخۆم جێدەکەمەوە
بە کرۆبێدەنگیی جوادەبمەوە،
دەریا تا بن مەمکانە.. بە قامکە پرچەک سەول لێدە
دەو بگاتێ و نەگاتێ هەر بە ماچ دەژمێردرێ
چۆرەک فرکەو چۆرەک مەرگ بۆنکە
پەنگرەکان سەرمابردییبوون
ئەستووکە هەنجیرەکان خووسانەوە،
وێدەچی.. ئەو هورەبایەش
(با)ی دەوولێوە سەرمەستەکان بی
بارانەکی (کەپرەشینە)ش داناکا
بەژن شەکرستانییەکان شینببنەوە.
پەنایەکم لەخۆم جێکردەوە
ئیدی رەنگە
بە یەکجاریی و بە ئارامیی جوادببمەوە.
ئای لەمنی دور هەرەسی دەمە مێخۆشەکان
پەنایەکی بێپایانیشم بووە
هەر متووی ماچبارانەکی هەمیشەییم.

شوباتی ١٩٩٧
بۆدرووم — تورکیا

# چلەک



Balindey balşıkaw – 300x389.jpg – Burhan Hejar

خەون بەکیویلکەیی تووترکەوە دەبینی
لە باوەشی بنوی .. لە باوەشت نەنوی،
بەروبەرخانیەکی سۆزپڕژێن؛
شەنگەبییەک لەبەرهەیوانێ بە هەربەست هەربەسترا.
قەد باریکی لق و پەلک
دەمنادەمەک رستەیی.. دەمنادەمەک بازنەیی..
شەرمەزاریی میوانە؛ پیرەموغانی کاروانسەرا
سوارچاکی رێرەوتی خۆشئاوازانە

قەیرە کیژی تەختەبانی هۆنراوە
تەتەری لێوی کۆستنامەنووسانە
قەد باریکی لق و پەلک
دەمنادەمەک رستەیی.. دەمنادەمەک بازنەیی..
شەرمەزارییەکی‌دی مێوانە؛
لەخۆگچکەنیشاندانی قەرات بەژنوبارات نەکەیەوە
لەخۆگەورەنیشاندانی پەیکەر بەژنوبارات پڕکەیەوە!
خەون بەکیویلکەیی تووترڕکەوە دەبینی
لە باوەشی بنوی .. لە باوەشت نەنوی...
خەون بە کوریکەسۆرەکی نابینی
لە پێخەی بدەی .. لە پێخەت بدا...
هێشتا خینی گەزگەز لەبەرچاوی سۆزە..
هەنکەییت ئاسا .. سەرشانی چەپم هێلانەیە
زەیتوونیش : هیچ / یەک چل بەدەست،
جارانییت ئاسا .. بارەکانت لە بارەکانی بتاوێنەوە
ئۆخە و ئازادیی لە قۆرایی عاسمانتان دەگری...
خەون بە کیویلکەیی توترڕکەوە دەبیبی
لە باوەشی بمری !؟

تەمووزی ١٩٩٧ - هەولێر

## پیاسەی سپی



Lebirit nakem -tabloy awiy,70x50,Kiyv.Jpg – Şemal A Selım

ئەو (کەس) نەبوو

یەک بارستە trووسکە بوو..

ئەو (کەس) نەبوو

شەقاو.. شەقاو، ڕەوتەکانی

یەک.. یەک، جێی دەستوپەنجانی

تێکڕای.. هەرهەمووم لەبیرە و لەبەرکردیە،

ئەو (کەس) نەبوو

مستەک.. دوو مست، تۆیە جوان و گەشەکانیم

لە خامۆشترین قوژبنی جامی سەرم داچاندیە.

وای لەو ڕۆژەی باغی یەکسانیی بەرەگرێ و

گەردوون بەشی خرمان دەکا !..
ئۆه لەو رۆژه؛ لۆ هەر هێلەک لە رێرەوتی
بە پانایی حەزەکانی (گور و فریز)ی دەچینم ..
رێزاورێزی شۆستەکانیش .. تروووسکە نەمام !
ئەوجا پیاسە ، پیاسە..پیاسە
تا هەناسەم بۆنی ئارەزووی لێدەتکێ و
بەژنوبارام لەسەر پرژی تروووسکەکان هەردەپرۆکێ
پیاسان دەکەم؛ پیاسەی سپی
سپی سپی وەکی کافوور.
ئەو (کەس) نەبوو
شەقاو.. شەقاو، رەوتەکانی
یەک.. یەک، جێی دەستوپەنجانی
تێکڕای.. هەرهەمووم لەبیره و لەبەرکردیه،
ئەو (کەس) نەبوو
یەک بارستە تروووسکە بوو..
ئەو (کەس) نەبوو.. تروووسکە بوو.
ئەو (کەس) نەبوو..

شوباتی ١٩٩٩
هەولێر



# درنەواییم
# بەچبێ ؟

3.16 KB,48x100.jpg – Burhan Hejar-

لەهەر بزرستانەک دەژیم
سواری شەپۆلە خێرایەکانی ئارامیی دەبم و
خۆم پەیدا دەکەم،
شەقاوەک دوورتر لەو نێزیکاییە
لە کەنارەکانی نێزیک رۆشنایی دادەبەزم
تەمومژەکی چڕ
بەژنی تەمەشاکردنە نەینۆکەییەکانم دەتەنی..
شتاقە ئەستێرەش ناجریوێنن
عاسمان بە پەراسووەکانی شەو تەندرایە،
درنەواییم بەچبێ
تازە ئەوشۆ رۆژهەرنایێ؛
گورەبەڕۆژەکان سووریخۆن..

جیهان لە سەرەمەرگە و
چاوەڕوانی منە گیانی بەبەربهێنمەوە !
ئەمنیش بمرم هۆنراوە زندیمدەکاتەوە،
لە هەر دەرکەکی دەچمە ژۆری
خۆم دەبینمەوە..
لە هەر جەنگەک بەسەردەکەوم
بە قەدی ئاشتیدا دێمەخواری،
دیسان دەرکەک دەبێخمە سەرپشت
بەسەر سینگی شەوەکیدیدا دەکەوم؛
لە باغەکی چۆل و پڕ جێپێ
جێپێی ئاڤێستا، تەورات، ئنجیل،
قورعان، تێکڕای ئەندێشە ژەهراوییەکان..
بۆنی هەروەشانەوەی خۆشەویستیی و
دامەزراندنی رک دەکەم،
درنەوایيم بەچبێ و بەچ درمبدەمەوە؟!
درنەوایيم بەچبێ .. تازە ئەوشۆ مانگهەرنایێ؛
ئەڤینداران لە ڕۆشنایی بگری،

ئاداری ١٩٩٦
ولیان - ئێران

# ژانوژوو

پێشکێشه بەو جاحێرانەی: (جوانییەکانیان سەرپۆش و
رازەکانیان پەنهان و
حەزەکانیان قەتیس)کراینە.



Wilati min dozexi aşiqane-100x90,Danimark.jpg-Şemal ASelım-

**ئەڤین خەریکە سەرهەرگری !**

**لە حەژمەتی پەژموردەیی جوانییەکانو**

**خەریکە تێکڕای چاوەکان دابڕژێن..**

**ئەوەی لە پاش رەنگوڕووە پۆشراپەکان بەجیما**

**تاقە ئەلبوومەک بوو**

لە تابلۆی ئەڤینە ساردوسڕەکان.

* * *

ئەڤین خەریکە سەرهەڵگری !
لە حەژمەتی حەشاردانی رازەکانو
خەریکە تێکڕای ووشەکان هەربوەرن..
ئەوەی لە پاش دەووزارە سەرمۆرەکان بەجیما
تاقە کاسێتەک بوو
لە دەنگی ماچە دووراودوورەکان.

* * *

ئەڤین خەریکە سەرهەڵگری !
لە حەژمەتی پەنگانەوەی حەزەکانو
خەریکە تێکڕای جەستەکان دابڕزێن..
ئەوەی لە پاش بەژنوبارا داخرایەکان بەجیما
تاقە شووشەک بوو
لە بۆنی ئارەزووە پەنگخواردییەکان.
ئاخ لە داخی دەنگوڕەنگی بندەستەییو
ئەڤین خەریکە سەرهەڵگری
خەریکە گیانی دەربچی.

ئاداری ١٩٩٩

هەولێر

# ژان له‌ ژووانه‌ك



پێشی ده‌مه‌ چوسته‌كانی شه‌وبوونه‌وه‌
له‌سه‌ر مێزه‌ك - ره‌نگاره‌یی -
به‌ رووبه‌ری نیگایه‌كانم داپرژا..
له‌سه‌رخۆ پچڕامه‌ روخساری شه‌وگرتیی،
دووبه‌دوو - ئه‌من خانه‌خوێ .. ئه‌و مێوان -
هێشتا
ده‌مه‌ چوسته‌كانی شه‌وبوونه‌وه‌ دانه‌هاتبوون
ئه‌وه‌ چه‌پكه‌ك نیگای قرتای
ئه‌وه‌ ده‌مه‌ك خه‌نده‌ی وه‌ستای
ئه‌وه‌ گۆلمه‌ك ماچی هه‌روه‌ری...
تا له‌ده‌می بێمنییدا په‌كی‌له‌سه‌رم نه‌كه‌وی.
ده‌مه‌ چوسته‌كانی شه‌وبوونه‌وه‌ داهاتن
هه‌ر دووبه‌دوو - ئه‌من خانه‌خوێ .. ئه‌و مێوان -

تا لەدەمی بێیەکدیدا
پەکمانلەسەریەک نەکەوی
لەمنەوە داگیرسا
لەویەوە تاوامەوە.
کە شەوبۆوە
هەر دووبەدوو - ئەمن خانەخوێ .. ئەو میوان -
ئۆف لە شەوبوونەوە و
بەگەڕکەتنی دەمە سستەکانی
مێزەکەم دارووخا...
نیگا و خەندە و ماچەکانمی خڕ پێچاوە و
هەر ئەو بەجیهێشتن..
بەجیهێشتم !
ئۆخ لە شەوبوونەوە و
بەگەڕکەتنی دەمە سستەکانی..

تشرینی دووەمی ١٩٩٧
هەولێر

## پێکچوون



Were naxim lem berdbaraneda – 30x30.jpg- Şemal Adıl Selım-

هیچ عەنتیکە نییە
ناخەک بە روخسارەکی بچی ..
کەناری گۆمی ئارەزووشم
بە لێوانی ئەو کەسە قشتوقۆزانەی
خۆشمدەوێن و دڕدۆنگیشملێیان،
ئۆخەی.. ئەتوش بێدارتری لە خۆتی بێپەنجەرەیی و
رەڕەوەی سەردەمیش لە دوادواییێت دەچەرخی،

## پێشان

سەرگەرمی سەنگەرلێدانەک بووم لە ناو با
تا شەڕوانە ئەفسانەییەکان و
سوارچاکە نوستییەکانی سەر گۆڕەپانی ئەندێشەمەندان
لەسەرم نەکەنە تەپوتۆز،
هەنووکەش
پایزە در هەمیشە بەهارەکەی من ..
بە ئاگایە
هاوین رادێخی و جستان بەخۆیدادەدا..
بە هوردەییش..هورد و درشتی
رازەکانی پووکانەوەی دۆستێنیی
- ئی من و ئەوان - هەستپێدەکا.
هیچ عەنتیکە نییە
روخسارەکیش بە ناخەکی بچی..
ناخەکەش بە منی دوڕ سەنگەری هۆنراوە و
ئەمنیش بێجگە لەخۆم .. لە هیچ ئافەریدەکی !

تشرینی دووەمی ١٩٩٥
چندار – ئێران

## هەرەسنامە



گوزەران لەسەر باری پەپوولەکی کافووریی
ژیانەکی سەرکەشانەم دەگوزەراند..
پەڕاگەندەیی لێواری دەمە پەمبەییەکان
گۆرانییە سەرمەشقییەکانمی هەربزوڕکاند..
پەککەوتەیی دوڕ پەڕاوە تۆزلێنیشتیەکان
سرووده سەرفرازییەکانمی هەرکڕوزاند ...
ئەی تاخلچە هەرە برندەکەی ژۆری پڕ ئەندێشە
گوردانە ناسک و رەنگ کەسکوسۆرەکەت
بەخشرایە
نەمامە تەڕپیرەکانی جوگرافیای سەرمەستیی
- چەچەکانتان خۆشبی بەچکە گرینۆکەکان -
گورەکان بێ قرتان و بۆنکردن
گورئاسا بەخێوکران

هەیتە بێئارەزووەکان لەبنوبۆتکەوە هەریانکێشان
خۆرەپۆکی مێژووی سەرسەختییان پێڕامارین..
دیوارەکانی ناگزووریی پێخرانە سەرپشتێ
لە پشت پەنجەرەکانی حەز و تۆرە و ئایندەش
تاقە دیمەن
ئەفسانەی هەرەسە بەسەر هەرەسزادەکان،
لە کیسەی هۆنەران بڕژێتەوە ؛
هیچ/ هۆنراوە بەدەست !
بە درنیاییەوە ئەووش هیچ و هەموو تشتەکە..
سوپاسگوزارییتان دەکەم.

شوباتی ١٩٩٦
شەهریار - ئێران

# چاوە قەتێیەکان



20.1 KB, 201x277.jpg- Şemal Adıl selım -

سەرپێیی لێممەڕۆنە و
خۆت تاوانباری چاوە قەتێیەکانت مەکە
کە ئەمن پڕ بە قەوارەی چاوانم
لە نیگایانت دەگرم،
ئەمن هەردەم
لەودیوی توی دیوارە بێ پەنجەرەکانتم
چ سەیروسەمەرەکە رازەکانتم لێوەشێری ؟!..
خۆ (پایزە در هەمیشە بەهارەکەی من)
نە دەزانی زریان و لافاو چییە
نە خونچەگورانیش دەوەرێنی،

لە ئارەزووپەروەرەکی مەسەنگرێوە
خۆت تاوانباری چاوە قەتێیەکانت مەکە،
ووریابە چەچەکانت ناسکن
بەتەنێ ئەنگوستەکانی من دەزانن
چجۆریی رایانمووسن !
دە وەرە و خۆت فجورێ هەمێزمکە..
لە هەمێزی شارەزای من
قولانج.. قولانج، بەژندەکەی..
سەرلەبەری ئارەزووەکانت دادەمرکێن،
دە وەرە و خۆت فجورێ هەمێزمکە..
لە هەمێزی شارەزای من
قولانج.. قولانج، بەژندەکەی..
سەرلەبەری ئارەزووەکانت دادەمرکێن،
دە وەرە و
چیدی خۆت تاوانباری چاوە قەتێیەکانت مەکە.

کانوونی دووەمی ١٩٩٦
مەلارد – ئێران

# سۆزباران



دیوارەک لە خشتەکانی شەو هەردەچنم
تا رۆشنایی رۆژە رەنگتەرخەکان
جەستەم ئالوودە نەکەن..
لێوە زەقنەبووتییەکان
هەنگینی گیانی شەکەتم هەرنەمژن،
ئەوێشەوێ
سەرگەرمی لەگۆڕنانی گورە رەشەکان بووم
پەنجەکانم هەرووەرینە
جامی ژەهرنۆشینی سبەینێم..

دوونێشەوێ
کە لە ناشتنی گورە پەمبەییەکان بوومەوە
چاوەکانم پەڕینە ژۆرەکی پڕ لە نیگا و
لێوەکانم ژۆرەکی پڕ لە ماچ..،
ئەرێ چدەبوو
ئەوشۆ
گور.. گور، تاسەی نیگا شەرمنەکانت
تریوەی لێوە تەڕەکانمی
بتکاندبایە پێکی چاوە مزرەکانت !..
سبەیشەویش .. بێچاوەڕوو
- بە یەک چەپکە نیگای نەرم -
تفری نەریتی لێوانتم رامارپبا و
بە دەنگی مرچەی ماچەکی پڕ بەدەو
بمردباین و زندیبباینەوە
بمردباین و زندیبباینەوە.

تەمووزی ١٩٩٥
هەولێر

# ڕەهایی



سەردەمەکی
لەسەر لەپی دەستەکانم دەڕۆیشتم
گورەکی بنەوشەییم نەدیتەوە
بۆنی هۆنراوە و
پرچی
(پایزە در هەمیشە بەهارەکەی من)ی لێبێ،
سەردەمەکیشە
دەستە لەشەختەگیرایەکانم

بەسەر تەرمی تێڕوانینەکانمدا هەرخرایە؛
بێجگە لە بۆنکەلاکی ووشە (پیرۆز!)ەکان
بۆنکەلاکی
قورعان، ئینجیل، تەورات، ئاڤێستا ...
بۆنی چیدیکە ناکەم،
ئای لە ڕەهایی دەستەکانم
چەند پڕ بایەخن
لۆ لێدانی سەنگەرەکی دی
تا بەدەستەک
ووشە و پرچ بهۆنمەوە
بەویدیکەش
هەرچی ووشەی (پیرۆز!) هەیە
لە گۆڕیانێنم.

ئاداری ١٩٩٧
خوی - ئێران

## ئۆقرە



3.10KB , 100x76. jpg – Burhan Hejar---

بەدیار رۆژاوابوونەکی دیکە هەرتروشکایمە
لقە تروووسکەکم
لەسەر بەڕکی ئەندێشەمنایە..
دەمنادەم تاوەبارانەک دادەکا
نیلۆفەرە پەمبەکانم لێکورژدەکاتەوە،
رەنگە تا لێوم لۆ ماچەکی دەبزوی..
یان ئاسۆیەک دەبەخشمە چاوە ماندیەکان

گەلەک ئەستێرە بەزگبدەن !
نازانم نە دەستوورەکی تازەم پێیە
لۆ ژیان و ژووان
نە رووباری رامووسانەک رامدەماری ؟
دەی..! دەبا ئەو ئێوارەش دابێ..
بەرکە چرابارانەک لەخۆمبگری و
نیلۆفەرە پەمبەکانم داگیرسێنی..
تا ئەمنیش بنوشتێمەوە
سەر نەمامەکانی بیرکردنەوەم
یان یاسایەکی بێ رێسا لۆ ماچ بهۆنمەوە
یان پوختە خۆم
بەئەسرینی چاوە برسییەکان بشۆمەوە .

تشرینی یەکەمی ١٩٩٥
چندار – ئێران

# ڕۆنتر



بەسەر ڕوخسارت دەدرەوشێمەوە
شەپۆلی تارماییەکان دەمکوژێننەوە..
نا.. نا، ئەی شەکەتترین شۆخی شەتەکدرای سەردەم
بمبەخشە.. لەو وەرزەی شەڕی (جەنگ و جەنگ)ە
ئەمن چیدی بە پەڕندەی خۆشەویستییت ناچووێنم
ئەتوش ئەمن بە خۆت
تا لەناو سەنگەری گور لۆیاندامەزرێین..
وەرە .. وەرە با هەر ئەوڕۆ
بەردەکەی ئامانج هوردوخاش بکەین
بە ئەندێشەش بڕێین ئەتو چاوەڕوانیمەبە،
وەرە با هەر لەبن ئەو ڕەهێرەی تارماییەش
چەترەک لە درەخشانەوەی ڕوخسارمان هەرکەین
زەیتوونی چاوەکامان بکەین بە پێخۆر
پێک.. پێک، ڕەنگڕووی ڕۆشنایی هەردەین.

ئابی ١٩٩٥ - هەولێر

## دەنگدانەوە

دەنگەک دێ
لە دەنگی سوتانی هەروەستەکانم دەچی
کە لە ناوانی بەردەک و بەردەکیدی
سەنگەرەکی پتەویان داتراشیە.
لە پنتە رۆشنەکانی
ئەودیوی دیواری نائارامیی
خانیۆکەکی بێحەوشە
لە دەنگ ڤیتدەکەمەوە..
تا لەوێ
لە ناوانی پەنجەرەک و پەنجەرەکیدی
بە تیچاوەکی بژییەمەوە..
لە ناوانی کارەک و کارەکیدی
بە هەناسەکی ببوژێمەوە..
لە ناوانی بێدەنگییەک و بێدەنگییەکیدی
بە دەنگدانەوەکی بتەقمەوە !

ئاياری ١٩٩٦
کەرەج — ئێران

## لێوڕانابینم..

سێبەری تۆخی کەرتکەرتەیی گیان
ئاواز؛ تیشکوتاو
سەردەم؛ چەواشە
موچڕکەئاسا.. نوقرچەی مۆخی هێسک ئاولەمەن،
شۆڕابەی گورگەی تەلاران ، جێخشخشۆکێ تەلانان
هەردووک بەرەو کەندوڕن..
هەی لە بیژییانت کەوی
خۆت فجوری بوونی ژەنگنکە
هاوار : نووسکەنووسکی دوڕ هەواری کاولگەیە
لێدوانیش : وەڕین،
زارۆکە پرچتووکنەکان
لە پەناوپەسیوەک، بنپنچکەک...
چاویان دەپشکوی
تەمەن قرچۆکیی بە بەژنی ئاودامەنە
دەنگدان گێلوویلیی سەر گووفەک،

سەرکردە ئەندێشەییەکان گڕوێرەک بەبەرکێدەکەن
دەووچاویان بە ئاوی چارەسەر بخەمسێ
لەو وەرزی بینەونییەدا،
بینەوبەردەدا..
بارستاییەکی لووتکە پڕ، چارپەڵبەسترای
داشدامەی چەرخی گەڕەلاوژێی راستۆکییە..
رستەی گەردەن گردەوگرد
پەتی هەریری سێدارە، پردی ئەندێشە، داوی ڤیان
داوەڕستی چورچەی بێزاخ و گومڕایە
لە جۆمەوە ئاسۆ تەرخ
جۆمەک، دوو جۆم، دە جۆم... لە شارەک تەختەکەین
چەنەلێدەری لاجانگ هەرپەرمی
لە بەردەوە بنار رەق
بەردەک، دوو بەرد، دە بەرد... لە شارەک ڕێکەخەین
درخێوراوەی ریچەی چوێرووێر.
لێوڕانابینم
جەستە پەنگری گیان خۆرەمێشیی
لە نەوراییەکرا لۆ یەکەکیدی
ڕەوت؛ بازنەیی .. تەکان؛ قۆناغی پاشەوپێشە...

تەپۆلکە ملکەچی چارەبەفرە
لێوار زەندقچووی سەراو
بەستەلۆکی بنهەنگران
جێتەختی تەختەبانی حەملاندنە..
وەرە پێکەک لە نەرمایی جەستەی گیان فرکە
نەبادا لە ڕێوبانان سەرخۆشی لارێیان بی
درنیاش؛ ماچ لە سمێران
لە مەمکان
لە هەمووی... هەر ماچە
بەس چێژیان جوایزە.

١٩٩٤
هەولێر

## ئاوازی نان

پێشکێشە بە :

سەرکردەکانی ( یەک دەرزەن پارت و ڕێخراوی خۆ بە مارکسییزان )
کە لەسایەیاندا کرێکاران لە سادەترین مافی چینایەتییان بێبەشن.

دڕدۆنگیی بەژنی شەقامی داگرتییە
کۆستبارانەکە.. خەم بە خەم دەکەویتەوە
هەرکەسەو تەرمی خۆی خستیتە سەرشانی و
ڕێی گرتیە...
هەیە بەرەو هات و نەهات
هەیە نەهامەتیی و ئاستەنگ.
ئەوان کۆست بە کۆست دەسپێرن
بە خەم دری خەمخانەیان دەدەنەو،
لۆ پێشەوە
گازاندە لەو پوشتەمرۆڤە بێشنگانە ناکرێ
بە ئاواتبوون
پەیکەری لەبیرچوونەوە
لۆ تەرمە بێنازەکان دابتراشن..

ئەوە شتۆ شۆڕەسوارە
لە حەژمەتی چۆلیی شەقامە بزرەکەی
بسکی شۆستان دەڕنیتەوە !؟
ئای لەو کارخانچییە بێسەروبەر و گێژانە
چەند بە ئاسانیی دەیانەوێ
بە سۆزی ئاوازەک سەما بکەین
ڕەزمەکانی لەسەر ترپەی
دری گەرمی خۆشەویستیی هۆنراوە و نان
دانەندرایە،
کۆستبارانەکە نەبیتەوە..
دەیانەوێ چەند بە ئاسانیی
نان – بەتەنێ بە چرا – ببینینەوە !
خەم – بەتەنێ بە خەم – بشۆینەوە !
ئای لەو لاجانگحیزە بێزاخ و قەلەزراوانە
چەند بە ئاسانیی دەیانەوێ...

نیسانی ١٩٩٣
هەولێر

# وەرسووڕان

بۆ (..... ، .....)

لە شەوەکی ڕەشتر لە کراسی داکە پرسەگرتییەکان
تازە دەگەینە دەڤەری ئەو پێدەشتە بەرینە:
ژنانیان بە ئاگری ئارەزووی پیاوانیان خۆدەسوتێنن
پیاوانیان بە سەرکەبزۆتی جەستەی ژنانیان
زامی پشتی هەسپەکانیان سارێژدەکەن،
تازە زەوی بە سپێدە درۆزنەکە هەرناخەرەتێ
باوەش لۆ گزنگ بکاتەوە و
ئاسۆش بەرەو لێرەوار
بەسەر بەژنیلەبارانگیرای تێبپەڕێ..
چێتره لێره .. خۆم بەسەر خۆمدا واژیی بکەمەوە
تا چاو بریکرد لە قازوقورینگان رامایِن
لافاو جێپێی سەر لمی لێواری ئاوەکانی لەدەستداین
چیدی پێخوستی ناو خۆرەپۆکی سەرڕێی گومڕایان مەبە
چێترە لەوێ .. خۆت بەسەر خۆتدا نخون بکەیەوە

داری بریایێ پنجەگیایەکی هەتاو نەدیدەی
بن بۆشکەکی ژەنگگرتیی نییە
تا گور ئاسا بیقرتێنن و
لە گوردانی کۆشکەکی مەخمەلیی بیچینن،
ئەمن لێرە .. عاسمانی کیشوەرەکان
لەیەک دەدوورم و لەبن خۆمی رادێخم..
با هەر
( رەنجی بیروبازووم- نان و
چاوە کشتو پڕ تروسکەکانی پایزە- چرا و
رەزمیسیمفۆنیای هۆنراوانم- شەیپووری چەوساوان)بی،
ئەمن هەر لێرە..
خۆم بەسەر خۆمدا واژی دەکەمەوە
ئەتو هەر لەوێ..
خۆت بەسەر خۆتدا نخون بکەوە.

کانوونی یەکەمی ١٩٩٤
هەولێر

هاتینەوە.. پەژیوانین
تێهەردەچینەوە.. هەر بەرایی بەگومانین
نابی وەبی !؟
ئەوە گوزەرانە
یان کولێرە خەونەکانی چەرخی چەواشە !
پێوەندپسان .. لۆ برسییێتیی شکان نەبی
بەچ دەچی،
کێ توانی
یان کێ ویستی.. لەسەر سەرتیلەی کاروانسەرایەک
چرایەک داگیرسێنێ ؟
ئەها ئەوەتە
ئەمن، ئەتو، ئەو، ئەوان...
کە خاوێنترینیانین
باوەشمان

لە كۆشی سۆزفرۆشەكی
لە هۆشی دەرمانخۆرەكی
لە ساختەبازیی پارێزەرەكی
لە بەروبەرپڕدێنی سەركردەكی
لە بەڕكوبەرباغەری قاچاغچییەكی .. پیسترە..
ناچارین تێهەرچینەوە
بەران بەرایی هەر بەگومانین
چار نییە و تێهەردەچینەوە
بەران.....
چار نییە و....
چاررر... ؟ ...

١٩٩٢
هەولێر

## ئەشكەنجە



Alay Kurdistan - 60x60 , Danimark.jpg-- Şemal A Selım-

ئامانج؛ شابەندەر .. هەرتشتەک؛ قاتیی
نەقیزەی لێزەر کاروان بزوێنە
مێزی مفتەخۆر؛
کۆکتێل : ئارەقە و ئەسرین و خینە،
تا دێ جوغزی مەینەت دەکشێ
شابەندەریش دوور و دوورتر..
کەچی ئەمە.. هەر دەکوتین و
هەرتشتەکیشمان قاتییە

ئەوەیە جەزرەبە !

پەتی هەنگڕان و پەتای ناگزووریی
چندرای یەک داون
حەزی تامەزرۆ و ئایدزی مەرگ
جمکەی یەک دەردن
جەستەی شەکەت و کەلەشی زەغەل
بەری یەک بارن...
ئەری کێهان مرۆڤگەل بەدوو قەلقەلاشک دەکەون
تا بە سیکاردەکی کول و ژەنگاویی
مێخەکی مۆخی ناخیان داغ بکەین؟
خەریکە سێدارە بگوازیتەوە
لەباتی مێگەلی مرۆڤ
نان و گور و چرا،
ئەڕێ ئەوە نیشتمانە یان زێدی سۆزگبوون !؟
ئەڕێ ئەوە ئاوات و ئامانجە
یان دوورگەی ئەندێشەئامێز !؟
ئەڕێ ئەوە نیشتمانە یان زێدی سۆزگبوون !؟

١٩٩٣

هەولێر

ساردبوونەوەی نیگا پەرتبووەکان بەبرینەکی تەڕوتازە
ساکەڕوومەتی بێشوختێ چلوورە رۆندکان دەگری..
وەی لەو گەردوونی تامەزرۆیی و سەرشکستەییە
بەشەو زیندانی رۆژگارەکی زیندانییترین بەردەوام،
چمانداوە لە رۆشناییە هێمنەکانی
سەرمێزە مەخمەرییەکان..
وەرە با ئەستێرەکی گەرم لەسەر پەنجەمان راگرین
چەپکەک تیشک لەخۆوەرپێچین
لەسەر رووبەری هەناسەی ئەڤینەکی مەزنتر
گۆلمەک غەرەپەنگر بچینین
تا خەرمانەک تیشک بچنینەوە
گەرمەسێرەک پەیدابکەین
کوێستانەکی لێهەرێخین..
نا نا ئەمن چیدی زەردەپەر ناکەمە بەرگم

مەرگی فڕندەو ئەستێرەو هۆنراوەی لەسەر هەرقەنم،
وەی لەو گەردوونی تامەزرۆیی و سەرشکستەییە
بەرۆژ زیندانی شەوگارەکی زیندانییترین بەردەوام
گەرمبوونەوەی نیگا چەقبەستیەکان بەبرینەکی ساردوسڕ
ساکەڕوومەتی بێشوختت نیفۆ ئاسا لۆچلۆچ دەبی..
نا نا ئەمن چیدی زەردەپەڕ ناکەمە ئارام
مەرگی پەپوولەو گورو کولێرەی لەسەر هەرقەنم
وەی لەو گەردوونی تامەزرۆیی و سەرشکستەییە
بەشەو و رۆژ
زیندانی سەردەمەکی زیندانییترین بەردەوام.

ئەیلوولی ١٩٩٢
هەولێر

# هەڕەت

پێشکێشە بە- پایزە- ی ئەڤیندارم



Rengekan lanewanmanda win bun - 60x45,Siwed.jpg-Şemal A Selım-

داوەپرچەک .. گزنگ‌پڕژێن
چۆڕاوگەی بەژنی حەسرەتمە
به کەمەری داخزاندا هەردەوەری،
مەگیرانیی بە دەنکە لمەک
دندووکی ئایندە گلێنە دەڕژێنی
کۆرە چاوساغی تەمەن.
گۆنام نەخشەی وراتەکی خوونتێزایە

لێویش مۆرەکی دزرای..
هەنووکە هەڕەتی ئەوەمە
بناوانەک - شیرناوی گیان .. تاراوی ماچ -
روو لە هەورازی بابمردیی و
بەرەو کێرگەی پرچ هەرقەنم..
تا ئەو دەمەی مەرگ مێوانی گور دەبی و
ژووان لە پەنای سابات دەمری
گورەهۆنراوەک - گەنمپرژێن -
گورەگەنمەک - هۆنراوەپرژێن - گورچن بکەم
ژەهری ماچیش لەسەر گۆنا
هەنگینی گیانیش لەسەر لێو ..

ئایاری ١٩٩٣
هەولێر

# پایز

ئێوارەکیان
باخچەکیان ژانی ژووانی گرت
وەبەر هاراوی هەناسەی پایزێ کەتم !..
بەهارم چوو.. گورم ژاکا ، هاوینم چوو.. پەلکم وەری
دە ئەی پایزی
لە بەهار فێنکتر.. درگیرتر.. قەشەنگتر...
با وەرزەکان تێکرا تو بن و
چرۆ و خونچانم وێکرا دێ..
ئەمنیش: قل.. قل، هۆنراوەی تەڕ.. گیانمت دەمێ،
دە ئەی پایزی
لە هاوین بەتاوتر.. گەرمتر.. بەجۆشتر
با وەرزەکان تێکرا تو بن و
چرۆ و خونچانم وێکرا دێ..
ئەمنیش: گور.. گور، ئەندێشەو سۆز.. ڤیانمت دەمێ،
دە ئەی پایزی لە هاوین و بەهار
گەللەک خۆشەویستتر ...

حوزەیرانی ١٩٩٣
هەولێر

# بێبایەخیی

پێشکێشە بە ( .... . ..... )
بێبڕستیی هۆنراوە و بلیمەتیی هۆنەر هاوکوفی
یەکنەبان خۆم لە ڕۆشنترین ژاوەژاو لوولدەدا.

لێوارمەرگ هەرمژین؛ مۆخە هێسک .. نۆژەن ژیان
سەرشێتی هوڕەبایەک .. پرسەنامەکی لەبیرنەکرای
ڕامووسان مەینەتبار .. مەینەتباران دادەکا
بای ئەڤینشێلدرای بەرپێی پێنج مردیشۆر
ئەفسووس بێگوڕترە بەرەو حاخامستان بە پێش‌خۆمبدا
بێنانیی .. دەرد لە شنەی ئێواران
بێکاریی .. سندان لە سرووەی سبەینان
لێو هەڵبڕین .. لێوبارانی گۆڕین مەرگ
بەزمستانگەلەکی وەکییەک .. پرسەنامەی بەستەزمانان
هەرم.. ئاو.. شەختە...
گۆلمەک هێسکە پەیکەری گورە بنەوشەییەکە
فرمێسک لە هیچ هیچتر .. زۆر
پێنج ڕک و بنئارۆزیی.. پێنج دەغەریی و سەرقۆزیی
دادەپرۆسی .. بێبایەخییش دەستەمۆ .

١٩٩٣ — ١٩٩٤
هەولێر

## ناوان

له شەقامەکانی ئەو رووبارە لێلە
- کە گۆزینگمان تەڕ نابی -
تەریک رادەوەستین..
سەرکردە و بنکردە چوختییەکان
خاووخلیچکیی
بە بەژنی سۆز و هێمنییمان
دادەبڕن،
ناوانمان گەردوونەکە؛
هەردوولا تەڕبووی بەربارانەک
هەردوو ئاوەڕۆش زەریایەک،
ئا ئەوەیە ترۆپکی چەشە و چێژ :
- جگە ئاو و با -
لە نان،
لە گور،
لە هۆنراوە...
لە هیچ هاوبەشیان نین !
شوباتی ١٩٩٣
هەولێر

## پرسنامە؟

سێ وەرزی لەیەکنەچوو
بە پایزەکم ئاشنا دەکەن
کتومت بەخۆم دەچی ...
لە کەسەک
گور لە ییخەی هۆنراوە دەدا و
هۆنراوەش لە ییخەی ئەوینەک،
هێی بەهاری بێپەلکە وەریەکانی دری پایز
ئەو ئەوینە درەنگدەمە مێوانتە..
بزانە هەتاوی پێیە ؟!
کەسکوسۆری پاشباران و
تریفەی مانگەشەوی پێیە ؟؟
ئەی بەهاری بێ پەلکە وەریەکانی دری پایز
ئەو مێوانە درەنگدەمە
بە پایزی بێ چوزەرە دەرکردیەکانی دری بەهار
بناسەوە و لێیمەترسێ !

ئاداری ١٩٩٣
هەولێر

## حەڤدەی چار

سارڕۆژی مەرگەکی تەمەندرێژ
دیسان .. برووسکەکی پڕئازار
گیانی ترووسکەیە لە جەستەم دەگەڕێ،
وەی لەو خامۆشسووتانە بەسفتوسۆیە..
ئەوە چ بەفیرۆچوونەکە؛
شەو بە خەونی رازەکانی رۆژدەکاتەوە
تا لە باوەشیدا نەژیم !
رۆژ بە رازی خەونەکانم شەودەکەمەوە
تا لە باوەشیدا بژیم !
ئای لە سفتوسۆی ئەو خامۆشسووتانە...
سارڕۆژی مەرگەکی تەمەندرێژ
برووسکەکی پڕئازار لە جەستەم بگەڕێ
دیسان .. هەر گیانی ترووسکە بێ،
هەر مانی ترووسکە بێ،
هەر مەرگی ترووسکە بێ !!!

نیسانی ١٩٩٣
هەولێر

## راسپارده

له پەنا تارمایی پەنجە گۆجەکان
چرایەک بەدیدەکەین
دەمەک بە تریفەی مانگ دەچی
دەمەک پەلکەزێڕینە،
بە چ دەچی !
کا پەپوولەکی سپی ؟..
پەیام..پەیام، رازمان ببا؛
ئەی چرا .. بەمانگ بڕێ
با خێرا بی لۆ جۆزەردان،
ئەی چرا .. بە بەهار بڕێ
وێکڕای پەلکەزێڕینە
پەلکەنانمان لۆ بینە،
خۆشت ئەی چرا..
- کز بی یاخود گەش -
قیچەک رۆشناییت لۆ بن خۆت هەبی !

کانوونی دووەم ١٩٩٣
هەولێر

# شێست و پێنج برووسکە هۆنراوە
# لۆ یەکترووسکە کیژ

**١٩٩٢\٥\٢٥–١٩٩١\٨\٨**

**(شەقراوە، هیران، رانیە، دەربەندی‌رانیە، سەرسیان، قەڵادزێ، کۆیێ، هەولێر)**



Xemi eşqeki doraw - 280 KB .1152x846 . jpg – Burhan Hejar--

سەرم بەکۆشی شەو دەکەم
تروسکە دێ؛
چەنگەک لە درم گیر دەکاو..
بەسەر سووتانم وەردەکا،
هەستم لۆ ناخم شلدەکەم..
ژانی درە بەخورپەکەم؛
دەمهەژێنێ و ..
تازەڕازی ڤیانەکی نووم
بەگێچکەدا دەچرپێنی.

## یەک خەندە

کاتە تەمەنەکی رووت و شپرزەیە
بەسەر تارمایی خامۆشییدا دەخشی
تانەی سەرچاوە..بەرانگژی بیلبیلەکی برسیو تاسایە..
ئاکامیش چاوەڕووانییەکی منجڕ و کوژەرە
برژانگی تیژ و رەشی قرتاندیە
تۆڕی تێڕوانینی دڕاندیە..
لەبەر دەروازەی خەروەتگای ژیانبردنەسەر
بە چۆکدا هاتیە،
سەرەنجامی خۆخواردنەوەی سەرانگرێبوونی لەسەرخۆش
وێنەی خەندەکی بێوێنە دەکێشی..
(کێ)ش چاودێرە
با بێ چەقووی قەپێلکیچاوە تەپیەکانی
بەملی لە مووەک باریکتری
تاقە بینەرەکەی فیلمی(یەکخەندە) وەنێ !

تا نەهاتی
پەنجەت لە هەنگینی گیانم هەرنەینایە
نازانی کێم،
تا ئاوازی ئاوەزیشم نەخینیەوە
هەرنازانی
خاوەن ڕۆژە سۆرچنەکەم
لە پەڕەنگی پاش زەردەکەی
جۆلانەکی قنجیلانەت لۆ چێدەکەم ...

## پێشبینی

ئەوە دەرۆم

تۆش بێئاگای لەسووتانم،

رۆژەک دادێ

تۆ دەڕۆی و

من بێهەستم لە بەستانت،

پاشەرۆژەکی دووریش؛

سووتان و بەستان

دەبنە جۆتەک خۆشەویستی رەتێندرای

نە بێیەکدی دەحەوێنەوە

نە پێکەوەش شاددەبن.

## دەربەستبوون

جەستەم خڕی
لە دوڕ مەکۆی چەشەوچێژدا لەتانۆکگرت
رووت پێپەتیی لەئەشکەفتەکی کەسنەدی گیرسامەوە؛
خۆراک: کژوگیا، خواردنەوە: کانی، هەناسە: بێگەرد
تێر خۆمهەرسووی لە خوساری چرگەگیایەک
بەردەزوورەک قرێژی پیستم پیّڕنی
گۆلمەک ئاونگی سەرپەلکی دارگیزەکم بەخۆمداکرد
لە باوەشی بەردەمردەکی هەرکوڕمام..
هەر کە خەوەکی بێخەموخەونم شکاند
تیشک و براچەی گۆرینێ
لەسەر تۆڕی دیدەکانم پەخشبۆوە !
دیسان هەمان
ئەندێشەی بەر لە رووتکاریی و
مەرگ و جواناوی ناوانی شۆستەوشەقامی بەرقەرام
لەسەر دری خۆشەویستیی تروسکەکەم
هەرقەندەوە.

## وەرگۆڕان

لەو دەمەیرا
چاوم بە ژیان کردیتەوە و خۆم ناسیە
بێ ڕۆناکیی و ئاکامەی
یەک شەقاوم نەهاویشتیە
تەنانەت کاتی نوستنیش
دەستم بە ڕووی
کراوڕۆژنە و
چرا و پەنجەرەی زۆرەکان
وەنەیایە،
لەو دەمەیشرا
تررووسکەکی گچکەلانە ..
شانی لە شانم خشاندیە
خۆم لە خرِی
ڕۆشناییەکان بێبەشکردیە.

# هاوەردیی



Key déytewe – 60x40.jpg – Şemal Adıl selım--

ئەوشۆ گریام .. قەراش گریا،
ئەز پرسیم : لۆ ؟
گۆتی : ئەوە سەردەمەکە
تروسکۆکەک
لە چیوەی بەژنم تۆرایە !
ئەو پرسی : لۆ ؟
گۆتم : ئەوە چل شەوەکە
چیوەی بەژنی
تروسکەکم لێ تەنرایە !

ئەگەر بێژم
ئەتو لە سیوانکە گچکەکانی
سەر زێی گچکە دەچی
ئەی هاوار بە بارم !
کوو .. راوکردنی راوچی
بە هۆشمدا بچی !؟

## بە سنەوبەریشم ناساندی

چاردەی مانگە و بە مەلوولیی
لەسەر قەراتی ناوانی
هەر(دوو زێ)دا هەرکوڕمایمە
سنەوبەر هات .. زاری درە بە زامەکەی
بە گێی دریپەستم وەنا:
" ئەتو چما
هەر بەتەنێ خەمی تروووسکەمانگەکەت لە کۆر نایە
ئەی ئەو هەژار و بێبەرییە نەشمیلانە.. ناتوورژێنن
ناتبزوێنن .. پەڕی ووشە و هۆنراوەتیان
لۆ بکەیە چەند هێلانەک !؟
ئەمن بەخۆم لە چۆمەکەی (مەرزەوانان)
بە یەک جاری گیانم سپارد
هونەرمەند و هۆنەر نەما نەمدوێنن ..
کەچی ئەوان
هەموو رۆژێ .. لەبن خانیە رووخایەکان
لە سێبەری بنەدارە تێکشکایەکان
مەرگی (لەسەرخۆ)ت دەدەنێ ! ".

# کۆرەڕاز

هەرچەند ئەندێشەی وا خەمگر
ئەوها تار و گورچیلکبڕ
نامۆ و ناکۆک و ناجۆر نین
بە هەبوون و بە بوونی من
بەران تاکو بە دیدەی خۆم
پەنجەی رکی تو نەبینم
خینی ناخمی لێدەتکێ
چجار درە بێئۆقرەکەم داناورێ..
درنیاشبە
تاکو ئەتوم دووردەست بی
راز و نیازم
بە خودی دەوت نەکرۆژرێ
هەر بەو دەنگورەنگەی جاران
هۆنراوەی تەڕ.. گیانمت دەمێ.

## چین و ئەڤین

ئەز رۆژنامەی"ئایسکراکەی بەلشفییان"م نەخیندتەوە..
بەران کاتەک
چرای دری هاوچینەکم دەکوژێننەوە؛
هەر بە بۆنی گێڕانەوەی گۆتەکانی
تامەزرۆ هەمووی دەشکێت و..
لەوپەڕی رۆنیی و دووربینیی
گۆرانی لۆ ..
رەشوڕووتی هەموو جیهان دەرێمەوە .

*　　　*　　　*

ئەز رۆشنایی"ترووسکەکەی هەولێرییان"م
هەرنەمژتیە..
بەران کاتەک
چرای دری ئەڤینداریم دەکوژێننەوە
هەر بە دیتنی رەنگی گورزە تیشکەکانی
سۆزم سەرریژ هەردەچیت و ..
لەوپەڕی مەستیی و سەربەستیی
هۆنراوە لۆ
هەستی تێکڕای ئەڤینداران دەهۆنمەوە .

# داوايەپرسيار! ؟

ئەرێ دەبی؛
داوی ئەنێشەی تێشووی من
کونی زەنگیانەی گیانی ئەو
دابرِی؟
یا تیشکۆکەی تروسکەی ئەو
شەوەزەنگی شەوینی من
دابدرِی ؟
ئۆه سەرەوەری خۆشەویستییم
دەبی ئەوەی دووەم نەبی !؟

## تەڕدەستیی

ئەگەر بێژن :
ئەتو توندی لە تێکۆشان..
دەنە کوو ئاستی ئامانجی
کارگەرانی سادەوساکار بەرچاو ناگری !؟
ئەمن تەنێ.. تاقە سووکە دیمەنەکی
لە ژیانی پڕ چێژۆچەشەی سەرمایەدار
پێشاندەدەم !

*          *          *

ئەگەر بێژن :
ئەتو لە ڤیان خۆپەرستی
دەنە کوو ئاستی تەمەنی
کیژۆرەکی ناسکوونازدار بەرچاو ناگری !؟
ئەمن تەنێ.. تاقە سووکە دیمەنەکی
لە قەشەنگیی و رەفتارجوانیی تروسکەکەم
پێشاندەدەم !

# رەشبینیی

کە ڕێبوارەک
لە شەوەکی ئەنگوستەچاو
ڕێی وێڵدەبی..
ترووسکەکی گچکەلانە
هەموو گیانی
لە ئاوات و ئامانج دەگری،
کەچی ئەمن
لە ڕۆژەکی ڕۆشن.. ڕۆشن
ڕێگام ڕاستەشەقامیش بوو ..
ترووسکەکی گچکەلانە
گیان و مانی
لە ڕەشبینیی و هەرەت گرتم .

## ئەتو برێ ! ؟

ویستم چەپەک ڕۆناکیی تیژ
بەرەو ژۆری تاریکی در
رابکێشم
لەسەر سنوور دایانچاندم !

*　　　*　　　*

ئەز خووم گرتیە
بەبێ ڕۆشنایی هەرنەکەم،
ئەتو برێ ئەو جارەیان
ڕۆژ ئێرەیی بە من نەبا !؟؛
ترووسکۆکەک بە ڕێککەوت
بەسەر سنووری کۆستەکەم هەربخزی
وەک پەنجەرە
تاریکایی ژۆری درە ناسۆرەکەم
هەربمژی !؟

تۆزی نامۆیی لە گیانم دەتەکێنم ..
هێلی ئەندێشەم سڕ دەبی،
جۆتەک گوارەی ئەودیو رەوشت
بە گێچکەتدا هەردەواسم ..
ووشە ئەڤینداریی‌یەکانم
هەروێست لە سادەییت دەگرن،
لەدوو پێناوەک دەگەڕێم ..
دۆستی دونێی دوژمن بەوورۆم راستدەبنەوە !
دوا چارەشم ؛
دوو ناوی قرتای لە رێگەی هاتوچووتدا هەربکۆرم !؟
نااا... ناتوام
دەترسێم ساتمەکی لێبکەی
هەزار خۆزگە بەبێ‌ئاگاییت بخوازم
نااا... ناتوانم .

# کێ!؟



tabloy awiy , 70x60 , Hewler.jpg - Şemal A Selim--

کێ هەیە بتوانی؛
جوانەکی بێ هاوکوف..
سادە بی و بێهوودە ..
یاخی بی و بێداڵدە ،
بییێختە یەک چیوە
توی کیژی جیهانی
ئەودیوی من نەبی !؟

# خۆزی

گەر دەتزانی
گوڕاحخۆشیی و گەشبوونەوەم
لەو ئێوارە..
چەند پەیڤەکە و
سبەینێ زوو
لۆ یەک پەیڤی شیرینی تو
دەیکەمە پرد؛
بێئاگاییت
لۆ دەکردمە دوو کۆرەگە و
چاوەڕوانی
پەرینەوەی منت دەکرد...
خۆزی بەخۆزی
دەتزانی .

زارۆکەکی ساوا
سەری مارەکی ئەسکو ئاسا
بەکارهینا لۆ ماست خواردن !
شێتەکی مەزن
سوپاسی دێوەکی کرد و
لاچمکەکی کورتەکی سەرکردەکی بڕی
لۆ کەپوو سڕین !
ئەڤینداری لات
هەردووکیانی ماچکرد و ..
بێژینگەکی گەورەی هینا
لۆ گرتنی
تیشکی ترووسکەکی گچکە !
بژی زارۆک و ... مەزنیی،
بژی شێت و ... لاتیی،
بژی ئەڤیندار و ... ساوایی .

## چوار چمك

ئەو نامەیەی بەراشکاویی
ئەمنی لەسەر تو نووسیەوە ..
لە (کێ)وە لۆ (کێ)ی قرتابوو کە خیندیەوە.

*　　　*　　　*

ڕەوتەکی پڕ کەندوکۆسپەو گیانیش لەجێیەکی سەختە.

*　　　*　　　*

ئای لەو بەش و پێبڕانە
چەندی سۆربوون بە لاساریی پێدادەگری..
هەندەش گڕی پەشیمانیی لە دوورگەی درم دادەمری!

*　　　*　　　*

دەی.. دەی،خۆ من دەستخەڕۆ نییم ..
تا دەستی خۆم بشکێنمەوە
خۆ بە زمانکورتیش نازانم ..
تا زمانم بگەزمەوە ..
ئەز یەک چرام ..
یەک ترووسکە دایساندیمە
بەگوڕی هەرچی ڕەشەبایە ناکوژێمەوە !

## دووڕوویی

پەڕی پارە و هۆنراوەکان .. هەر کاغەزن
وەلی دوو جۆر دەنگیان هەیە،
ئەگەر ئەمنیش
هەندی پەڕی هۆنراوانم
گێم لۆ رەقەی پەڕی پارە هەرختسایە ..
هەنکە دەنگیان رادەدێریم..
توش بێ فریاد
هارەی دەوەکی دادڕای لە گێچکەتدا دەخرینگاوە .

*　　　*　　　*

مرۆ پاک و دەغەرەکان .. هەر شێوەکن
وەلی دوو جۆر ناخیان هەیە،
ئەگەر ئەمنیش
هەندی هەستی مرۆپاکییم
بەدوو دەستی مرۆی دەغەر بخزیمایە ..
هەنکە ناخم فرۆشرابوو..
توش بێ پەروا
سۆمای بەژنەکی دارزای لە دیدەتدا دەبریسکاوە .

ئەورۆ .. گوڕی
گەردەلوولی خۆشەویستییم
دوو جار بە تاقە بیانگەکی
بەرەو دەرکەی خانیەکەتان را پێچیدام
تو دیار نەبووی ..
خەمەکنەبوو بە دیداری چارەمینت
شادمانەبووم ..
ئەوەی ئەمن ئازار دەدا؛
تو هەردوو جار زانیت هاتم
ئاخ بێئاگا
نەتدەزانی دیتنی تو بوو ئاواتم ؟

## ئاسوودەیی

رۆژگارەک پڕ نیگەرانیی و ترسئامێز
تەمەکی چڕ و داوەستای ..
رووی نەینۆکی بەژنوبارامیی تەنیەوە .

* * *

حەجمان دەمەک بەر زریان و دەمەک گڕکان .

* * *

ئاکام : بەرەو رووگە خزیم
بە دەو رۆیین ئاگرم دەسوتاند ..
هەر کە لە پشت دەروازەدا
چاوەکانم
بەسەر تیشک و رۆشنایی ئەو
گیرسانەوە؛
سەرلەبەری دیواری تەم
- غەم و ستەم -
تاوانەوە .

## پەیامەک

هۆ گورەکەم - ئەی نەشمیلە خرپنەکەم -
لەو دەمەیرا توم ناسیە
نووکی خامەی هۆنراوانم
لە رووپەڕی ئەڤینداریی تودا نەبی
هەرگیزاو هەرگیز نانووسی..
مانیگرتیە .. پارێز دەکا لەو ووشانەی
هەست و نەستی ناخی من و
قشتیی و قۆزیی توی قەشەنگیان
لۆ ناکێشرێ !
هۆ درەکەم - ئەی خانمە خنجیلەکەم -
دەتوش ئاوڕەکمان لێدەوە ؛
با خامەکەم .. تا حەزدەکەی بە رەوتی تو
- توی رۆشنایی تازەڤیانم -
لەرێدا بی ..
هەموو شەوێ بەژنی چوستت
- شۆڕەبییەکەی باغی ژیانم -
لە پوولەکە پەیڤان بگری.

# ئۆیف!

سەرلەسپێدە
بەسەر داری خەونە هۆنراوان دەکەتم ..
هورەبایەک هەریکردم،
ئەگەر لەپڕ رووی ئەندێشەم
یەکانگیری
رووی بەرواژی
ووشەی (ئۆیف)ی ئۆینبازییت
نەبووایەوە ؛
نە دێری ئاوی ئۆینی توم
بەسەر دەرژا..
نە چەند درۆپە ئاونگەک
بەسەر گیانی کرپەسەندیمدا
دەپژا.

ئەورۆ لەدوو
سەروسۆراغی پەیامەک
- بێسەروشوون -
دەخولامەوە ..
لە ناکاوەک تووشیهاتم
بەسەر رووبەری رووخساری
تاوامەوە،
ئاکام : کە رۆیی؛
هەرووەستەی کرد؛
بەسەر بەژنی سەرنجمدا داچەماوە
هەرووەستەمکرد؛
سەرنجەکی برند برندی تێگرتم
پەیامەکەم
لە ناوانی کەژاوەک و
سێدارەکیدا دیتەوە .

ئەو ووشانەی
بە رۆژ .. لە ژۆری مێشکمدان
تا ئێوارە
بە تەبایی .. لە شاییەکی بازنەییدان،
کە شەو دادێ و
بووکی ووشە و هۆنراوانم
- تروووسکەکەم - دادەبەزی؛
هەر لۆ سەرچۆپیگرتنەکی
تەرمی دەیان ووشەی ناسک
بەسەر یەکدا دادەکەوی !..

# خەووگرتن

شەقام :

کراسەکی درێژ درێژە ..

کۆرانیوەش :

کونەکی رۆشن رۆشنی ئەو کراسەیە..

هەموو رۆژێ

دووجار نەبی .. دەبی جارەک

بەسەرخۆمی داهەرکێشم و

لەسەرخۆمی دابکێشم ..

لە هەردووکیش

رۆشنایی سەرم قووت بدا و

لەبەر دەری داییێخراتان

گیانی بە گورِ تیڕامانم

دەربکێشم .

## لۆ ! ؟

ئەز لۆ..کرێنووش
لۆ گور ببەم
کە گور کرێنووش
لۆ رۆژ ببا ؟
رۆژیش .. بێ شەرمەوشوریی
هۆرتە .. هۆرتە
لۆ بارەگای من وەرگەرێ..
چەندەک تیشکوتاو پێویست بی
لە رۆشنایی ترووسکەکەم
وەریبگری !.

## شەوەڕەش

ئەستێرەکان پۆل .. پۆل ، وەرین
مانگیان دزی ، پەردەی ئاسمانیان هەربڕی..
یارۆ شەوگارەکی تووشە
نەکەی لۆ چرکەک چاولێکنێی .. هەناوەکەم،
بست .. بست ، بەژنی تاریکایی هەردەچیتن
هەرەت، هەردێر، زەنەک، زەنوێر .. یەک..یەک
پێشوازیمان دەکەن، بە چاوی پێ کوو رێبگرین،
ئەو کۆشکە سپی و مەڕمەڕییەی .. کە توی لێنییە
خین و ئارەقە و ئەسرینمە .. نایرووخێنیین
تەنێ پیسیی و سەرمایەی لێ دەسوتێنین ..
هەرچیو هەرکێی هۆگریانە،درخوازیانە قاویاندەدەین..
شالوورەکان ئازاد دەکەین
ئەوجا یارۆ .. ووریابە گوریان بۆنەکەی
توخنی بزگوریان نەکەوی
بۆنی درن و رشانەوەی تەکنیک و دۆلاریان لێدێ،
یارۆ شەوگارەکی تووشە
نەکەی لۆ چرکەک چاولێکنێی .. ترووسکەکەم .

دەڕێن :
" تاریکیی هەموو جیهان
خڕکەیەوە ..
ڕۆناکیی مۆمەکی
پێناکوژێتەوە "
ئەمنیش دەڕێم :
" تروووسکەکی گچکەلانە
بە تاریکیی دەروونمدا
هەرواسرایە..
ڕۆناکیی
هەموو جیهان .. گەمارۆیدا
بزر نابی و ناشرێتەوە .

# نزگره

خۆخواردنەوە

لەسەر بەژنی بیرم دەخزا..

رۆژگارە وا پەکیخستم .. مردامینم،

ملکەچی خۆشم نەدەبووم ..

ئەڤینە وا شلیکردم .. سەر دانوینم،

هەر ئاشنایەک دڕەش نەبی

بەگریانو نزگرانم پێناکەنی..

چونکێ ئەمن ؛

وێنەی گەشی ترووسکەکەم

تەنێ لەسەر

رووی ئەسریندا بەدیدەکەم .!

## سەرپشکبە

چەپکەک هۆنراوەم
لۆ ناردی..
نە با هەراسانی کردی
نە بارانیش تەڕیکردی،
چت لێمەوێ
ئەی خانمۆکە گچکۆکەکەم ؟
جۆلانێ بی؛
ئەوە رستەی هۆنراوانم.. هەریانبەستە،
شیرنیی و شەکرۆکە و هەنگین بی؛
ئەوە ووشەی هۆنراوانم.. هەمووی لۆ تو،
هەرچتدەوێ...
تو بەتەنێ
گۆمی مەنگی بێئاگاییت.. بشلقێنە؛
رێتلێناگرم .. سەرپشکبە - ئارەزووت بی-
وەرە درم بقرتێنە .

ئەو دەمانەی .. تو بە گورە رووڵک دەچووینن
با بزانن
ئەمن تەنێ لەو گورەدا
خۆشترین بۆن و شیرنترین چێژ..
بەدەستدەینم !
سەرەکە و تازە بردیتم .. نایهینمەوە .

*          *          *

ئەو دەمانەی .. هەندی خونچەکت لێدەکەن
با بەژنی تو
لە کامیرەی چاوی مندا
بەدیبکەن !
سەرەکە و تازە هینایتم .. نایبەمەوە .

# پوختەی تارمایی

تەمەکی چڕە و
کە پرۆکەی بەسەر
چڕگەگیای ترۆپکی مەزندەمدا کردیە..
بارەکی ناگزوورە.. تیشک سێبەرەتارمایی دەخەملێنیو
یاسا چەند ساویلکەکی بگۆڕی لۆ چەند ناچیزەکی..
تەمە و .. رەنگە نەگەمە قۆناغی بەراییێ
ئێوارەم بەسەردا بێ.
لە کەس تورە نابم ..
ئەتو بەمنت کرد - کوو ؟
ئەمن بەتوی ناکەم - لۆ ؟
نازانم .. نە رێبەدیی پێنابەم ..
نە ئاوزایی و هاکوفییم
لێدەکەنە لێرەوارەکی چڕ و.. رێی تێنەچی !
تەمە و .. رەنگە نەگەمە قۆناغی بەراییێ
شەوم بەسەردا بێ.
تەمە و .. لەوانەیە بگەمە قۆناغی دواییێ
بوخچەیەک تەم و شەوم بریبی .

# هات

زۆر لەمێژە .. " قاتوقڕیی "
بەرانگژی ئاواتمە..
بەران ئەوسار
لە گشت لایەک هەر " هات " مە؛
تا رادەکی کەم ؛ ئازادیی،
تا رادەکی کەم ؛ بژێویی،
تا سەت رادەش ؛ ئەڤینداریی .

## هەشت گرکان

هێلەک؛ ناسک..چەماوەیی
ئاسۆی زیندەخەونی کەساسییە
ناوانی گەشخاریناموییو رەشخاریئاشنایی داگرتیە،
داوەرستی مەرگ و جاویدانیی
بە تارماییەکی تەڕ و خامۆش داپۆشرایە،
رۆشنایی کزر.. کزر، هوردوخاش دەبی
برستی هورەش .. ساقەسۆرەی پەرپووت
لەسەر چیمەنی چینەکردن.. دەبەستی،
درۆپەک ئاو.. یان توخمی توخمەسەیان
یان هوردە ئارەقەک..
داوی کۆستەک و چەرمەسەرییەکی درێژ درێژدادرە،
ترووسکەی ئاواتەکی سەرکردی
ناسناوی کرنووشبردن، نامۆئاشنایی، شێتییە،
دۆستە قرچۆک و رازگرەکان
هەشت گرکانی گەرمونەرمن..
هەموو رۆژێ.. پۆلەک پۆری بێهێلانەم
بە ئاسمانی رێبەندانیان تێدەپەرنو.. هەردەکزێن.

# گەشبینیی !

کاتەک لاوەک
دەکەویتە داوی شۆخەک..
رەشبینیی گیانی دادەگری،
کەچی ئەمن
تا داوەکەم دەئارۆزکێ
گەشبینییم پتر دەچەسپێ ..
چونکێ چەندی تاریکاییم چڕ بیتەوە
ئەز سەت هەندە
ترووسکەکەم لەبەرچاودا
گەش و گەشتر دەبیتەوە .

# پرسیارەکی قورس



Xendeyek – 300x445 . jpg – Burhan Hejar-

یەکەم دیدار ؛ بێئاگاییت کرۆژتمی،
دووەم دیدار ؛ بە خەندەکی ئاودار
نەشتەرگەریی زامتکردم،
نازانم .. ئەو دیدارنامەش
چت لێدەکا ؟!
چم پێدەکا ؟!
نازانم م م م م ؟!

**پرسیم**

**- ئەرێ..کێ دەتانی پێناسەی جوانییم لۆ بکا ؟**

**یەکسەر مانگ پەنجەی هەربڕی :**

**گۆتی : کۆیێ بە کیژەوە !**

**- ئەدی پێناسەی ڕۆشنایی ؟**

**ڕۆژ ڕاپەڕی :**

**گۆتی : هەولێر بە ترووسکەوە !**

**- ئەدی پێناسەی ئازادیی ؟**

**بێجگە لەخۆم کەسەک نەبوو**

**بە ڕاشکاویی و لە ناخیەوە**

**بێ و ببێژی پێم : کارگەر بە بایی کاریەوە !**

ئەمن لەپم رانایێخم
تا بەسەری دابڕۆن و..
ئەوجا پاشان پەنجەکانم
شەمامەی سینگوبەرۆکان قل قل بکوشی ،
ئەز ناحەزی خودی خۆمم
گیانم قوربانی ڤیان دەکەم ..
با چرنووکی ترووسکەکی
جوانیی و ئەندێشە و ئاوەزم
دابڕووشی !

## پێچەوانەی

گەر ناحەزان .. پێیان گۆتم :

- ترووسکەکی گچکە و رۆشن

لە شەوەکی ئەنگوستەچاو

براچەی بێ ..

یان ئەوەتە شەو دادەمری

یان ئەوەتە ترووسکەکە گیانی دەردێ،

ئەمنیش دەرێم :

- پێچەوانە..

شەو.. ترووسکە جوان دەنوێنی

ترووسکەش.. شەو دەنەخشێنی .

تا دێ نوستن
بار.. بار، لە بارەگای ژانم
کاروانی کۆچ و کۆچباری
بەرێدەکا..
خەونیش پۆل.. پۆل،
بەسەر درەختی ئەندێشەم
کەڕەسیسەکی چڕ دەکا،
زۆر لەگینە .. ڕۆژەک دابێ
خەونەکانم
خرپیان سەرخەوەک بشکێنن
خەونەک بە نوستن ببینن .

## كورژه

چاوەڕوو ..دەنكەک تەزرەی بەهارەكی درەنگ درەنگە
وێكڕای ماچكردنی زەوی دەبیتە تەم ..
سەر بە گۆنگەر بێئەندازە.. چاووڕاش كاری تێناكا،
روونكردنەوە، پرسیار، خواستن ..
سێ ئامانجی پەیامەكی سوڕگومكرایە و
لەسەر لێوی گۆڕەكی سۆر بەلادادێ..
بێ لێزەری دووچاوی رەش، دوو گۆنای گەش
تك.. تك، شەرمی لە رووان دەتكێ،
دونێ هەتاوگازی ببوو
ئەوا ئەوڕۆش لەسەرماندا كورژەیكردیە.. تاوی دەوێ..
گۆرمەز خۆشە بەبێ بۆنە .. چاووزاریش كاری لێناكا،
زۆرلەگینە وەرام تانەوتەشەرەكی خنكێنەرویێسەروبەربی
پڕگومانو گریمانە ترووسكەكیش براچەی لای منبزربی،
ئەدی ئەوە نییە
تادێ شەو لە خولگەكانیدیشەوە دێن گەمارۆی دەدەن.
ئەمنیش هەرلەدووڕرا خۆمدایتەبەر چریسكەیوپێیدەژیم
دونێ هەتاوگازی ببوو
ئەوڕۆش ئەوا لەسەرماندا كورژەیكردیە.. تاوی دەوێ..

## دووەم دیدار



Her dim – tebloy zeytiy 70x60 , Taran . Jpg – Şemal A Selım-

نازانم چەند چرکەک دەبوو
لەبەر دەروازەی ژۆرەکەت
چاوەڕوانی دووەم دیداری تۆم دەکرد..
هەندەی ژمارەی چرکەکان
بە ساران داری تەمەنم .. بەژنی دەکرد،
کاتەک لەپڕ لێمهەراتی و
بەری دیتنت لێگرتم وەکی هەتاو..
گیانم گۆڕا و
خڕی بووە یەک پارچە چاو !

## برووسکەک

هەرزەکاران .. پەی بە تێنوتاوت نابەن،
ئەتو لەکنەوان پەنگرەکی رووتوقووتی
هەرکە دەستی ساردوسڕیان گەرمبۆوە..
بە ماشەی ژەنگاویی مێشکیان هوردت دەکەن ،
کۆستکەوتی نی ؛
تا شینەکت لۆ بگێڕم.. لێیتێهەرکەمە سەردوولکان
شایشت لە در ناگەڕێ
رەشبەرەکت لۆ دابەستم .. لێیتێهەرکەمە گۆییندان،
سەرەڕۆیان .. پەرەنگی تو هەستپێناکەن
ئەوان دەچن لەبن ساباتێت دەپەستن
تا تیشکی رۆژ نەتپڕووکێنی
ئەز دێم .. خودی رۆژ دەبێخمە بن ساباتێ
تا گڕشەی تو نەیسوتێنی !
کۆستکەوتی نیم ؛
تا شینەکم لۆ بگێڕی.. لێیتێهەرکەیە سەردوولکان
شایشم لە در ناگەڕێ
رەشبەرەکم لۆ دابەستی .. لێیتێهەرکەیە گۆییندان.

دوو مانگ دەبی
وێنەی ئەو (خەندە)ی لۆتکردم ..
لەسەر تۆڕی دیدەکانم لاناکەوی..
مەرجە ئەوجارە پێشئەوەی
لۆ ئەکتەران
ریفراندۆمی گشتیی بکرێ؛
پێیاندەرێم :
با خەلاتی باشترین ئەستێرەی سینەما
بە تو بدرێ ..
پرسیشیان لۆ ؟
دەرێم دیارە نەتاندیتیە؛
برۆن برۆننە ئەکتەری
داهێنەر و دەرهێنەری
(خەندە)ی هۆلیوودی هەولێریی !

# ئەمن و سەرسیان

" سەرسیان " ی هیشکو برینگ
جوانبازی ..
بەو زێیە پان و پۆڕەی
بەردەوی دەکا؛
کە "سیوانکە" بارەفڕکێی لەسەردەکا !

*　　*　　*

" ئەمن " ی روخسار داچۆڕایش
شانازی ..
بەو درە تەڕوتووشەی
ناخم دەکەم؛
کە "ترووسکە" تەڕاتێنی تێدادەکا !

## دەچیدی..

خانیەک حەڤدە نهۆمەو قادرمەکی لاپڕەسەنگی هەیە،
شەقاوە گرانەکانیشم سەربارن !
بەبێدەنگیی لە دەرکەکی بێئگا دەدەم..
کۆمەرەک پەنجەرە دەکرێنەوە، دایاندێخم..
بە هێمنیی لە دەرکەکی بێئاگا دەدەم،
دەچیدی ئۆباری ئەو رەوە مامزە مەبیێخە ئەستۆم،گیانە..
با ئەمنیش .. هێمنیی و بێدەنگیی
لەبەرپێی بێئاگاییت سەربرم.

*        *        *

باخچەک حەڤدە پێیە و سیمدرەکی چرووپری هەیە،
برینە کولاوەکانیشم سەربارن !
بەسانایی دەست لۆ خونچەکی ساوا دەبەم..
چەپکەک درک رێملێدەگرن، لایاندەبەم..
بە سووکیی دەست لۆ خونچەکی ساوا دەبەم،
دەچیدی تاوانباری ئەو کۆمەرە ساکارەم مەکە، گیانە..
با ئەمنیش .. سووکیی و سانایی
لەبەرپێی ساوایيت سەربرم.

# دوو راستیی و پرسیارەک

کارو کاردانەوە گۆتیان :
ئەمە هەردووک
لە ئاراستە پێچەوانە و
لە برِی ماوەدا یەکسانین،
ئەمنیش دەرێم : پێچەوانە
ئەمن و ئەتو
لە ئاراستە هاوتەریب و
لە برِی ماوەدا جوایزین،
توش .. نازانم
ئەی ترووسکە بێهودەکەم
ئەز نازانم .. تو چدەرێی ؟

## لەسەرکردنەوە

نیوەشەوەک ..
ئاگاملێبوو
بێئاگاییت هانیدەدام؛
لەباتی خۆم
ئەو پەخشان و هۆنراوانەی
بەسەر بەژنی توم هەرگۆتیە
بیانسوتێنم ..
ئەگەر هۆنراوەی نووش هاتن
خۆیان بە بەژنم هەرواسی
نەیاندوێنم،
لەپڕ زانیم
هەرچی ووشەی ناسک هەبوون
راستبوونەوە..
چەپکەک ترووسکەی رۆشنیان
لە ناوانی بێئاگایی و سوتانمدا
قیتکردەوە .

## دەتو لەڕێی..

"پێشکەشە بەو کیژە قۆزەی کە جوانییە لەڕادەبەدەرەکەی نەیتانی لەخشتەم ببا"

ئەورۆ بە رۆژ.. لە ئاپۆڕەی زەماوەندی مردیەکاندا..

دوو گڕی شین

لەبن پەرچەمی برێسەی بەژنبرندەک .. بەدەرکەتن؛

ئەز راجفریم .. شاخینبەری مەرگوژیانم لەکارکەتن..

ویستیان تارمایی روخسارم بلێسنەوە..

تروسکەکەم لەویش نەبوو..رۆشناییەکەی شاردمیەوە!

لە دوا کاتدا.. کە مردیەکان گیانیان بەبەردەهاتەوە..

برێسە گورج..گورج

برووسکەئاسا پارێزییەکی لێستاندم و

لەگەر پەرچەم هەردانەوەی دەسترێژەک تیشکی تێگرتم

ئەگەر زرێی رۆشنایی ئەو- تروسکەکەم- پەنام نەبا

هەنکە گیانم لەبن هاراوی ئەو گڕە هەردەقرچا !

دەتو لەڕێی ئەو جۆتە پیرۆزە شینە

با ئاهی ئەوان نەتگری

یان ئەووەتە..رۆشناییەکەت خامۆشکەوە..

یان ئەووەتە..جارناجارەک

لە گیانبەخشترین پەروانەت بپێچەوە .

# ئاگاداریی

لە تێڕامان .. ئاوی چاوانم دانارژێ
لە رێبواریی .. ئاوی پێیانم دانایێ..
هەرچی بکەم ؛
هیچم نییە لێیبترسێم .. لەدەستیدەم..
تەنێ بێئاگاییت نەبی..
چاوەڕوانییم هەردەلووشی و
پێی گیاندەدەم .

## ئەستێرەکانیش!

ئەوشۆ هاتم
قولینچکەکی عاسمانی توم .. بەخۆمدادا
لەرزمهاتێ و
تاریکایی گەمارۆی خڕِ بوونمیدا،
کێبزانی .. ئەستێرەکان
ڕژاینە ناوان لێژگایی
بارستەی تو و بارستەی من ..
ووزەی گەرمیی و
ڕۆشنایی توی ترووسکەکەم .. لێدەدزن !؟

## سووتانی سەرما !

ئەوە هاوینیش کۆچیکرد
لەکنە من پایز دانایێ..
ئەوان بەدووی
خانی گەرم و بزگورڕ وێلن
ئەز لە گەرمان پشیم نایێ،
تاکو ئەوهاش
تەزووی گەرمی ترووسکەکەم لەبەردابی..
سەرما لە سنووری بارستە گڕگرتیەکەم
هەردەقرچێ و
گیانم هەندەی داغ دەبی !

## ناوازەیی

ئەوان .. لۆ ئەوە
پەنجەرە دروستدەکەن
تا لە ژۆرێی تاریکیانڕا
تەمەشای رۆشنایی دەرێیان بکەن ..
چونکە ئەوان
تارماییەک بەسەر ترووسکەی دریاندا
هەرێخرایە.

*　　　*　　　*

ئەمن .. لۆ ئەوە
پەنجەرە دروستدەکەم
تا لە دەرێی تاریکمڕا
تەمەشای رۆشنایی ژۆرێم بکەم ..
چونکە ئەمن
ترووسکەیەک لەناو تارمایی درمدا
دایسایە.

# هۆنراوە و باران

یاسایەکی سروشتییە؛
زەوی دەوی بکاتەوە
عاسمان هۆن.. هۆن، دابارێنیتە فرمێسکان..
ئەز بە نووکی خامەی
هیشکم
بتدەمە بەر ورشەو پڕووشەی هۆنراوانم
پێم پێبخەنی،
چونکێ هێشتان؛
ڕێکوپێکیی زەوی و عاسمان
نەکەتیتە بن چڕنووکی
چەپۆکی کتکە مرۆیان،
داوی منیش
تا دەگاتە قۆرایی توی تەنکەڕووبار
دەئارۆزکێ
بە سەت داو و تۆڕی مرۆی سەرمایەدار .

# ئاسوودەیی




Her degeremewe - 80x60 , Danımark.jpg - Şemal A Selım -

وا دێمەوە

هەرچەندە ڕێم ناگاتە تو ..

لە شەقراوەی هاوینەوار تێناپەڕی؛

بەران "سەفین"ە شێتەکەی لەمەڕخۆمان

بای ئەوەندە

با و برووسکەی توی ترووسکەی لۆ گڕدایمە..

تا دەمگەیێ .. یان دەتگەمێ

نەمریونەژی بۆنت بدا هەناسەکەم .

## دەربەستیی

لەسەر سووگەی خەندەکەتڕا
کوچکەبەردەک دەهاوێژمە
شووشەی ناسکی بێئاگاییت ..
زۆنگاوەکی پیسوبۆگەن .. رایدەکێشی!
لەبن خانی نزگرەتڕا
تفەک دەگرمە عاسمانی
کۆشکوتەلاری زەنگینان
دوکەرکێشەکی رەشوپیس .. پەرتیدەکا!!
شەقری چەنگ و شێوەی لێوم
لەسەر رووگەی
چەند برووسکەهۆنراوەکی بێنازمدا
تۆماردەکەم .. تو تێیناگەی !
دەپێمبری .. ئەی برندتر لە گیانەکەم
نازانم من
دەبی کووکوو و دەبی چبکەم !!؟

## بەرابەریی !

ڕێبوارەک ماندی .. خانمەک سایەوە ؛
یەکەم : بە سۆز.. هۆنراوەی تەڕ
نازی گوراوپڕژێن دەکرد،
دووەم : بە رک.. تروووسکەسەرنج
ڕەنجی دڕکباران دەکرد،
تومەز یەکەم :
لە ئاوەز و قۆزیی و نژار
نایابتر بوو !
دووەمیشیان :
لە هۆنراوە و نان و ئەڤین
بەچێژتر بوو !

# هۆنراوەکی مەست

چارەنووسی ئەو هەوارە پەنگخواردیەش
باسکەتەلانەک دەڕمێنی .. تا کانیەکی پڕکاتەوە
دیوارەکی پان هەردەنێ .. تا دەنگەکی کپکاتەوە..
پەنگری راز و ئەندێشەشم پەیپێنەبەی
بە سوخەت خراپت ناچووێنم،
وەرە جوانیی ئەفسووناوییت مەگەچرێنە
تەنێ جارەک
دەستەک بە سۆمای چاوانی ماندیم وەنێ
برۆ تێر.. تیر، لێو بە بادەی
پڕ ئارامی ئاران و کوێستانم وەنێ..
تو چتدایە لە ژماردنی گورە وەرزییان !؟
هەر ناتەوێ عاسمانەکەت سامار نەبی ؟
وەرە با لەتو خواستن و لەمن دان بی ؛
هەتاو، هەور، باران، بەفر،...
هەرچت دەوێ
لە جوگرافیای ناخی مندا دەستدەکەوی .

## بارادەستیی



تا بەرانبەر جوانبازەکان
نەرمیی و پێخوستیی نەنوێنی و
بە تریفەی مانگیان نەچووێنی..
سووکە ئاورەک
وەرامەکی راگوزەریشت نادەنەوە،
ئەز بێباکم
لەوەش پتر فیزیان سەرکا .. هەر بێباکم ..
تووڕەشمکەن؛
دەچم مانگیان لێدەدزم ..
تا هەرگیزیش نەیبیننەوە
دێم لە پەنای تروسکەکەم
دەیشێرمەوە .

ئەوشۆ ویستم ببمە بڕیار؛
یەک هۆنراوە
بە درێژایی بەژنی کورت و
بە کورتایی بەژنی درێژت
هەرببڕم..
پەنجەو پێنووس و ئەندێشەم کۆبوونەوە
هەرچی کردیان
لە درێژاییان دەکردەوە
لە پانایان دەبردەوە
لە پانایان دەکردەوە
لە درێژاییان دەبردەوە
نەیانتوانی پیوانەی بەژنە قنجەکەت
ببیننەوە .

ئەو گورەی وا
تا هەنووکە
قرتان لەفەرهەنگی ئەودا
دانەهاتیە..
دڕکەکی تیژ و ئەستووری
بەناو لەپم داچەقیە،
هەرچەند خۆشم دەپچڕمەوە؛
نە لەپ .. لۆ پنجی لە دەستم
نە دڕک .. لۆ دەستم لە پنجی
دەبیتەوە .

# وەرچەرخانەکی دی



Biri mirdin dekem - 80x60, Hewler. jpg--

سەرم بەسینگی شەو دەکەم
ترووسکە دێ؛
شەپەک لە درم هەردەداو..
بەبن خامۆشییم پەرتدەکا،
هەستم لە ناخم دادێخم..
ئۆخەی درە بە ئۆقرەکەم؛
دەممەیێنی و ..
دەنگی سوای کەونە رکەکم
بەگێچکەدا دەگرمێنی.

# یەک ترووسکە

## لە پشت پێج تارمایی

**ئابی ١٩٩١- تەمووزی ١٩٩٢ ( شەقراوە،هەولێر)**



Lebirit nakem - tabloy awiy , 70x50 , Kiyv . jpg -

## تارمایی یەکەم

ڕەنگەکیدی ناپۆشرێ
لەبن سێبەری بەژنتدا رابکشێ
گەردوون لەناو لەپت دەنووی
نوچدان لە نەدیدکەیی چێتر نییە
چیمەنەکی سۆرچن
بە کیسەرە و سن نامری
لە کراورۆژنەی مۆختەوەڕا تارماییەکان بکوژێنەوە
بە هاراوی تروسکەکی هەردەقرچێ
چۆپلانەکی ئاوقات و سەراسوو
خۆی لە چیوەکی شەت دەگری
ناوچەوانی ناگزووران شەقری خنسان بی
ستانپەرستیی
پەچەی سەرچاوە و شەرمەزارییە
ئەوەی خدوو بە راستۆکییەوە بگری
دەستوپێسپیەکی بێشنگوتۆقە
گێ لۆ زیرەی بەسفتوسۆی لەشفرۆشان قوراغبکرێ
بێدەنگیی تاوەک هەروێستە .

## تارمایی دووەم

شەوەزەنگەکی رۆن
رێزەک ووشە و رێزەک فرمێسک
ئاوێتەبوون .

*          *          *

زەوی بە ئاخ و ئاویەوە
چوپەکی پڕ بای
سەر زۆنگاوەکی پیس و بۆگەنی بوو ..
شۆستە لە عاسمان
شەقام لە رێسمان
رەوت سەراوقوون
ئەژنۆ لەجێچوون

*          *          *

ووشە خوازراو بوو .. لە پووچترین رستە..
کێ دەزانی
فرمێسکیش جواناو بوو
یان چرکاوی
بەر تاتەشۆری گیانی ترووسکە!؟

## تارمایی سێیەم

چەند لەوجرە
ساوایەکی یەک سار ئاسا زێڕکم لێیچووە
چ سەردەمەکە تێیکەتیمە
نزگرانم بەشی شوستنەوەی خەندەکی ناکا
سێبەرم با
لەسەر چەقی تۆپەلەی ڕۆژ
ئاگردانەکم چێدەکرد
نووسەنەک با
بەستەلۆکی باکوورم دەکردە نیشتمان
شەپلە قوڕەکە و دەمنادەم بە بناگێم دەکەوی
زریزەی گەمانو تاوانی تەمەنمو ئەوە نا یەکەکیدی
لۆ دەبی گڕناگەی لەمن داگرتبی لۆ
هەر لەبەرئەوەی
ئەو خەندەکی دەستکردە و
ڕەنگی خۆشەویستیی شوانەکی گرتیە
ئەمنیش گریانەکی بەکۆرم
نازی رکی ترووسکەکم ڕاگریتە!؟

تارمایی چارەم



Limistan - 60x60,Danimark.jpg- Şemal Adıl Selım--

ئەو شارەدێیەش مەکۆی بێسەرپەرشتانە
کەژاوەی سۆرباو
لەبەر هاراو و هورژمی بۆنسۆی چەواشەی چەپدا
ئالوودە دەبی
چەقەی نیوڕوانێ شەو دەمانپۆشی
لە بازرەقەی سەرسامیی ئاپۆڕەی میللی و
ڕەپایی شەقامە چۆڵ و لاتەریکەکان
خۆمان دەدیتەوە دەنێژراین،خۆمان بزردەکرد دەبۆرژاین
رۆژگار پاشەوپاش تەکان لۆ پێشە
دوورگەی ئەندێشە چارشەوپۆشەکی تێدا جارکێشە
دروشمە بێنازەکان بە حەسرەتەوە
بەبەردیواری دیوانیقاچاغچییان دەکەتنوەهەردەقۆزینەوە

ئەو کسۆکانەی دەرکەکانی گوزەرانیان پێلەڕێسمەبردن
به وشتکرایی لەسەر شیشەبەندی دەروازەی برسییێتیی
چە پۆکیان قژکردبۆوە
لە دەرەزی تیشک و تەمۆخی ئاوەز
جەستەی ریچولەڕ.. گیانی بەرخۆدان دەحەسانەوە
جەنگەکی بێزەوەر و پلتۆخ
لەسەر تورتایی زارەکی چەور و خز خلیسکاین
هێرژانی بەر قرچەی گەرما و
هۆرتە.. هۆرتە، گەڕانەوە بە درساردیی
هوردەزیخی پەنگرئاسای کەنارمۆخمی لەخۆیهەرسووی
ئاسیاوەکی ئاگزووریش سەربار
لە گەرمەی هەرس و پەرتەوازەی خۆپیشاندان
بە پرسیارەکی تێکچڕژای - مامر ئاسا -
شێتییێتیی و بەدنژاریی تررووسکەبازیمی سەربڕیو
لە چیوەی شەرمەزارییەکی پۆشتەش سۆریکردەوە
ئەمنیش تێمقوچاند
وەیلۆ لەمنو ئەنگۆ و ئەوان بێ کاروبار و کاولێ
ئای هەر لەخۆم بێ پێناوێ
بێ یاوەر و بێ دەربارێ .. شەرمەزارێ .

## تارمایی پێنجەم

ئەتوش پاسەدانی بەرچاوڕاستی ناڕاستییەکی کوشندەی
بەچکە بێوەژنەکی ڕێنجبەر نەبای
لە گۆڕەپانی ئاوەزەکیدیم تیرباران دەکرای
کەشتی عاسمانان لە دیوەخانان لەنگەر ناگری
هۆنراوە کیژۆرەکی بیژی لێکەتەوە ناویانلێنا پەخشان
لۆ هەندە لەناوچووی کەلەپوور لێتمارەبکا
مەگیرانی بە گلۆتە قەسپۆکەکیش بکرێ
تەریفەیی بە ئاوی چاوان ناشکێ
کەم لۆ زۆر و زۆر لۆ کەم قەوچە قەوچە
بە ڕۆژەک دەتخینمەوە و بە سارەک ناتنووسمەوە
بە ڕۆژەک دەمنووسیەوە و بە سارەک نامخینیەوە
بڕۆنە ئەو تابلۆیەی ئەودیوی مەزندەت
لە تاریکیی بن چرایەکی گیر بوویمە
گەردەک تروسکەشم بەبەر ناکەوێ
بەوانیدیت دەسپێرم لۆ تو گورزارن
بە بەتەنێییم بسپێرن
لۆمن سەربارن، کۆلەوارن، ژارەمارن .

# لێرە و لەوێ

**ئاداری ١٩٨٨ — ئابی ١٩٩٢**

**( ڕەزگە ، سەرکەند ، شەقراوە ، ورمێ ، مەهاباد ،**
**دۆڵەکۆگێ ، نێوزەنگ ، نۆکان ، چەکوچ و سادر ، هەولێر )**



Serdemi xoşewıstıyman beserçu - tabloy awıy leser ketan ,
80x70 , Malmo. Jpg – Şemal A Selım -

# ئاوئاو بچن !

پیستیش فرێدەن ..
پەیکەری مۆخیان پەچە دەپۆشی
تەمەنی کیسەریش بەشی فێربوونیان ناکا،
یەک دەقە هۆنراوە
لەهۆرەبانی سەرکردان ناخیندرێتەوە
گۆبەرۆکەکیش
لە کۆڕی هەرقرچاوان نابریقێتەوە..
چیدی رک درەفەتی ڤیان نایێ..
ئەفسووس ئەو هێلانەی بە یەک ناگەن
بەژنی منی بەسەر ئەودا قرچاندەوە
تیشکی رۆژی لەسەر مانگدا شکاندەوە..
دەنا؛ رۆژ رۆژ دەبوو .. شەویش شەو،
هێسکەکان
لۆ دووزەلە و فلووتیش دەستدەدەن !
هەرهەویلێ ؛ دوونێ پێرێ مەرگ دەیبردەوە

ئەورۆ سبەی ..

سبەی دووسبەی .. ژیان دەدۆڕێ

هەنکەش؛ هەر ئەو بایەی دێ

دڕک گوری فەرهادانە و

هوڕە بەهار دەبەستی

گوریش دڕکی شیرینانە و

زریان پایز دەسووتێنی

ئەرێ هێلەک - راست وەکی تۆخ -

بێ بۆنو چێژ، بێ دەنگو رەنگ، بێسەنگ.. نابی!؟

ئاوئاو بچن..

سارەکم لەناو سنووری کەرخی بزربوون دیتەوە..

زۆر درەنگە .. چێترە وەیە

ناوناتۆرەیان لەخۆمدامارم

ئاوئاو بچن !

# داشۆران !

بەناو جەنگەڵی پاش رابوون
رادەگوزەریم..
هەندەک شۆڕەبیم دەدیتن
هیشک.. هیشک، داچەمابوون..
تا لە نێزیک
بە دەوی خۆم نەمدواندن
نەمدەزانی
لە شەوگاری کپبوونەوەی رۆژگاری رەش
مرۆڤ هەیە هەرخودی خۆی
وەک کارگەکی بەرهەمهێنەر
خین چێدەکا لۆ فرۆشتن..بازاڕیشی بەهەرمێنە..
تەنانەت پارچەی جەستەشی
وەک هەر تشتەک لەبازاردا
هەڕاج دەکا و دەیفرۆشی !!!

# دۆڕان

که دوا هەژان
کرۆکی خاکی ڕاچرەکاند..
بنار جما؛
لقی ڕووت و بەفرگرتیی
بن بە بنی درەختەکانی .. داتەکاند.
کسپەی ئەوجارەی دەروونی ناخی گەردوون
بەرەنجامی
مێژووی گەڕاوەی مێژووە
تەرمی نازە
نازی تەرمە
بەسەر رستەی گیانیش دادریَ..
یان ئەوەتە؛
هوڕە کزی دەکاتەوە و دەیپڕووکێنی
یان ئەوەتە؛
زریان هیشکی دەکاتەوە و دەیمەیێنی.

## هەڵپەرستیی

جاران وابوو؛
مێردەجمەی کەویکرای چەنگ پڕ باروت
لە رووبار و زێی زێدەکەم
مەلەی دەکرد
جیهان لە گێی گای نوستبوو ! ،
کەچی ئەورۆ ؛
سەرۆکی خڕ سەرۆکانی
هەرچی شەڕ و خینرێژتنە
لۆ چەند بیرە نەفتی دزرای
بارانی رەش
بەسەر کەنداوی گڕگرتیی و
تەڕ و هیشکی ناوچەکەمان دەبارێنی !

# گەر

گەر دەخوازی؛
به جوانیی و قشتیی و قەشەنگییت
له خشتەم بەی ..
درم وەکی ئەنگوستیلەک له پەنجە کەی ..
ووشەکانم بهۆنیەوە و له ملتی کەی
هۆنراوانم وەکی پوولەکە و پرپران
به لاملان و بەسەر سینگوبەرۆکتدا
پەخش بکەی ...
ئەوە هەندەی تەمەنی خۆم
با هەر سڕ بم
بێ ناز و راز و ئەڤین و سۆزنوستی بم،
گەر دەشخوازی؛
هۆنراوانم .. سنووری هەرچار دیوارت ببەزێنی..
حەزت .. وەکی حەزی سرِم .. تەرازوو بی ...
ئەوە سینگم - تێکرِای جەستە و بیرکردنەوەم -
گۆرِەپانی راز و نیاز و راموسانە..
هەموو گەمەک لەخۆدەگری .

## شەوبێداریی هۆنەر

دەڕێن هۆنەر درناسکە
لەگەڵ لەنگەری فڕینی
بارەفڕکەی پەپوولەکی
هەردەبەزی و دادەبەزی،
کە ووشەکیش سەردەبڕن
گیانی دەبێتە یەک کۆپلە،
بە تیری نەرمەنیگایەک
بە چێژی گەرمی دەستبازیی و راموسانەک
وەکی بەفری بەربارانێ دادەکەوی..
کە چرای دری هەر برسییەک
لە هەر جێیەک.. دەکوژێتەوە
ئەو لەجێیخۆی پڕ بە پیستی دەتلێتەوە.

* * *

وەلی با ئەوەش بژنەوین :
لە شەوەکی کڕوکپو ئەنگوستەچاو
بەردەک لەجێی دری دانێن
هوردە هوردە نەرم دەبی و دەبیتە ئاو !

# پێشبار

هەرکێی لەدامەنڕا راما
هیشکەکەرەکی بەر ئاسۆی  لێبووە چیا
ئەوەی لەسەر قۆپی چیاشڕا
ئاوی چاوانی دادەرژا
تراویلکەی بەر دامەنی لێبووە زەریا ...
ئەوجا ئەتوش - ئەی ئەڤینی ئایندەکەم -
رێم لێنەگری ؛
لەوان جێیانڕا نەڕوانم و
ژیانت هاوتا بی بە ژیانم..
رێت لێناگرم .. وەرە ببە
بە پزدووک و تانەی سەر هەردوو چاوانم .

## پەیامی ئەڤینە لەبارچووەکەم

ڕەنگە وێکڕای هەر جوولەکو هەنگاوەکت
وێکڕای چرپەی کێهان بەشی لەشت هەیە
نیگایانم تێکچڕژابن، دایانبەستبێتە سەمایەک..
یان هیچ نەبی ؛ دەی ڤیرسی
خۆم دایتەبەر گێژەلوولکەی هوڕە و باڕەش
بەشکەم ئێە ..جارەک لەجاران
بە قەدپار و ڤوتکەت کەوم .. هەرقۆزمەوە
ئەوساش هێدی ؛ هێدی.. هێدی،
لەسەر خڕێ و نسێیانت نەتران دەم و بخزێمەوە،
بەران هیچ دەمەک نەمتوانی و هەر ناشتوانم
لەسەر مێزی هەڵپەرستیی پەنجەی ئەسپێکوژەم مۆرکەم
داوداوی پرچم دەرینم
دوو گوریسی هەندی بەژنت بهۆنمەوە..
بە ریشار و ماسولکەی لەش
چارشەوەکی نەرمونیان بچنمەوە..
لەو چارشەو و گوریسانەش .. جۆلانەکت لۆ چێبکەم

لۆ تاتایێ لەناویدا بسێیەوە .

ببوورە لێم

ئەی دوا خاری کوژانەوەم .. ببوورە لێم..

گەر نەشبووری قەیدی نییە

کە کێرگەی حەز و ئۆخەکەت بێبارانی وەک من نییە

قەیدی نییە،

ئەمنیش لۆ تو و لۆ هەوری توش

بە دە پەنجان

پەڕی لێخۆشبوونیخۆمتان لۆ مۆر دەکەم

کە من بەدوو

کێرگەی حەز و ئۆخەی تازە .. دەخولێمەوە .

# تریفەی مزگێنی

ئەی ئەو شۆخەی.. بە تو نەبی
گرێکۆرە و ئارۆزکاویی
پرێسکەی حەز و ئۆخەکەم ناکرێنەوە؛
چیدی لە بچمی ژاندارم تووڕە مەبە.. مەپرینگێوە.
گەر ناشزانی.. لۆ ئارەزووی دواندنت.. هێخەم دەگری؟
روو لەمنکە و ئەو مزگێنییە پڕ هەتەرەم لێبژنەوە:
ژان ژێدەری شەقاوەکی تامەزرۆمە و
لۆ ئاوازی ئاوەزەکی سپی سپی سەما دەکا..
پەنجە لەسەر کۆرەوەریی باو دادەنێ ،
ئیدی پیرۆزیی و ستایش..
چاوبەستەگێ و تێکڕای ئەندێشەی ئاسمانان
لە فەرهەنگی ئێستا و ئایندەی چارەنووس.. دانارێژێ،
ئەوجا بەری ئەویندارییو رەوشتی من
ئەویندارییو رەوشتی تو .. یەکدیگیر بن؛
بەبێ پەروا و بە ئارەزوو
تاو نا تاوەک.. لەناو کەژاوەی ئۆخەمان
شیلەی حەزی چەندان سارەی مەندو وەستامان دەنۆشین.

دەستمان بە رووی
شەوەڕەشی زەقتەبووتی ژیان وەنا؛
هەوارەکان
یەک.. یەک، لەبن پێمان رمان ..
تەقینەوە ...
هەرکڕووزان ....
بۆنسۆی مەرگ
پەڕبەپەڕی خاری گەش و رەشی مێژووی
رۆژەرەشی نیو سەدەمانی هەرووەراند،
دوا کۆگەشمان؛
ریشمان لەریشی پاسدارو ئیسلام ئارا
لۆ تاتاییش ئەستێرەی کاروانکوژەمان
لێدارژا.

## تیشكۆی ڕەوت



Kıçe qerecek295x480 jpg–Şemal A Selım

لە دووریانی سێبەری غەم
لە بن باری شەوەزەنگ و
لە چرایی تاریکیی‌و تەم
نیگایانت پرشنگیدا..
لە دوریدا
برووسکۆکەک ترووسکەیدا
لەو کاتیەوە
پرشنگەکەت رێی ئەڤینم
ژوانگەی ژینم
ترووسکەکەش
پێچوپەنای ڕەوتەکەمی
پێدەبینم .

ئاداری ١٩٨٨
ڕەزگە

# ناوەڕۆك

